# له نێوان مام جەلال و مندا

ئازاری 1999 – شوباتی 2001

- بیرەوەری
- دۆکۆمێنت
- لێدوان

**پێشکەشە**
**بەوانەی گلەییم لێ ئەکەن**

**ناوەرۆک**



## 1. گەڕانەوە بۆ کوردستان

لە دوای راپەڕین، سێ جار، هەر جارەی بۆ ماوەیەك، لە سێ قۆناغی ناسك دا کوردستانم بە جێ هێشت بو:

جاری یەکەم، لە رۆژانی گفتوگۆی بەرەی کوردستانی - بەعس دا.

خولی یەکەمی گفتوگۆ (20 – 1991/4/28) مام جەلال رابەریی کرد منی لە گەڵ نەبوم.

خولی دوەمی گفتوگۆ (5/7 – 1991/6/17) کاک مەسعود رابەریی کرد منی لە گەڵ بوم.

زیاتر لە مانگێ لە بەغداد ماینەوە دوای گەڕانەوەمان بۆ کوردستان من بڕیارم دا کوردستان بە جی بهێڵم. لە سەر سێ مەسەلەی

سەرەتایی لە گەڵ مام جەلال و هەندێ لە ئەندامانی مەکتەبی سیاسی (لیرە بە دواوە م س) ناکۆك بوم:

یەکەم، جۆری بەڕێوەبردنی یەکێتی و گۆڕینی لە چەند ڕێکخراوێکی بێ سەروبەرەوە بۆ حیزبی دەزگا و دامەزراو. ئەمەیان ئەگەڕایەوە بۆ ڕۆژانی شەڕی یەکەمی خەلیج.

دوەم، جۆری بەڕێوەبردنی پێوەندی لە گەڵ پارتی.

سێیەم، جۆری بەڕێوەبردنی گفتوگۆ لە گەڵ بەعس.

نەم ئەویست کێشەی ناوخۆ، کە شەڕی خۆبەخۆی چەکداری لێ دروست ئەبو، بۆ یەکێتی دروست بکەم بە تایبەتی لەو کاتەدا لە لایەکەوە گەڕانەوەی بەعس و لە لایەکی ترەوە زاڵبونی پارتی و بزوتنەوەی ئیسلامی هەڕەشەیان لێ ئەکرد. بڕیارم دا سەرکردایەتی یەکێتی و کوردستانیان بۆ بە جێ بهێڵم خۆیان بێ مشتومڕ و بەربەرەکانی بەڕێوەی بەرن. بە بێدەنگی لە دەروازەی ئیبراهیم خەلیلەوە چوم بۆ تورکیا و لەوێوە بۆ لەندەن. ئەوسا سەرچڵ قەزاز نوێنەری یەکێتی بو لە تورکیا.

لەو ماوەیەدا کە لە لەندەن بوم کتێبی **"کورد و عەجەم: مێژوی سیاسی کوردەکانی ئێران"** م ئامادە کرد بۆ چاپ و هاوزەمان لە سوید و لە کوردستان بڵاوم کردەوە. دواتر چەند بەشێکی لە لایەن محەمەد ساڵح گەلاڵییەوە کرایە عەرەبی و لە وەرزنامەی "پەیڤین" دا بە زنجیرە بڵاو کرایەوە.

جاری دوەم، دوای ئەنجامدانی هەڵبژاردنی گشتی (1992/5/19)

بەر لە بەستنی یەکەمین کۆنگرەی گشتی یەکێتی (1/27 – 1992/2/14) بە چەند ڕۆژێ گەڕامەوە کوردستان بە هیوای ئەوەی کێشە سیاسیەکانی ناو یەکێتی لە ناو کۆنگرەدا بە لادا بخەین. هەندێ لە هاوڕێکانم، بۆ دابین کردنی دەسەڵات و پلە و پایەی تایبەتی خۆیان، لە کۆنگرەدا فێڵیان لێ کردم و دەستیان بڕیم. کێشەکان بە چارەسەرنەکراوی مانەوە، بەڵکو قوڵتر بون.

هەڵبژاردنی گشتی بۆ یەکەمین پارلەمانی کوردستان لە بەردەمدا بو. پارتی و یەکێتی لە ململانێیەکی سەختدا بون. ئەمجارەش نەمویست کێشەی ناوخۆ دروست بکەم، هەمان مەترسیە ناوەکی و دەرەکیەکان مابون و گەورەتر بوبون. ئەوەی لە توانامدا بو، لە پرۆپاگاندە و کۆبونەوەی جەماوەری و نوسینی وتار و پشتیوانی لە کاندیدەکان تەنانەت ئامادەکردنی بەرنامەی هەڵبژاردن، بۆ ئەنجامدانی هەڵبژاردن و پێکهێنانی یەکەم حکومەتی کوردستان کردم. ئەنجومەنی نیشتمانی کۆبوەوە (1992/6/4) و پۆستی سەرۆکایەتی ئەنجومەنی وەزیران بە یەکێتی سپێردرا (1992/7/4) د فوئاد مەعسوم بو بە سەروەزیر. قەڵەمڕەوی دەسەڵاتی یەکێتی لە زاخۆوە تا کفری درێژ ئەبوەوە. ئەمجارەش بە بێدەنگی لە دەروازەی ئیبراهیم خەلیلەوە چوم بۆ تورکیا

و لەوێوە بۆ لەندەن.

لەو ماوەیەدا کە لە لەندەن بوم کتێبی **"حکومەتی کوردستان: کورد لە گەمەی سۆڤێتیدا"** م ئامادە کرد بۆ چاپ و هاوزەمان لە هۆڵەندا و لە کوردستان بڵاوم کردەوە.

جاری سێیەم، پاش گەرمبونی شەڕی یەکێتی و پارتی.

کە شەڕی یەکێتی و بزوتنەوەی ئیسلامی هەڵگیرسا و، دوای ئەوەش شەڕی یەکێتی و پارتی دەستی پێ کرد، زیادتر لە 16 مانگ بو من لە لەندەن دانیشت بوم و دور بوم لە دەزگای بڕیاردانی ناو یەکێتیەوە. خۆم دور راگرت بو لە کاروباری یەکێتی.

مام جەلال بۆ گەشتی سیاسی هات بو بۆ ئەوروپا. بە تەلەفۆن داوای لێ کردم منیش لە گەڵی بم. بە بیانوی جیاجیاوە ئەمویست خۆم لەو ئەرکە ببوێرم. دوای سەردانی فەرەنسە و ئەڵمانیا هاتە لەندەن. روی لێ نام کە ئەگەر بۆ هاوڕێیەتیش بێ لە گەڵی بچم بە تایبەتی کۆبونەوەیەکی سۆسیالیست ئینتەرناسیۆنال لە تۆکیۆ هەبو.

لە گەڵی چوم بۆ ئیسپانیا گەلێ کەس و حیزب و کاربەدەستمان بینی لەوانە: خافێر سۆلانە کە ئەوسا وەزیری کاروباری دەرەوە بو. چوین بۆ ئیتالیا سەرکۆمارمان بینی. هەندێ بەڵێنی گرنگمان لە هەردوکیان وەرگرت یارمەتی حکومەتی هەرێم بدەن. لەوانە چاپکردنەوەی کتێبی قۆناغەکانی سەرەتایی و ناوەندی و دواناوەندی، مەشق و راهێنانی پۆلیس و هێزەکانی ئاسایشی کوردستان، یارمەتیدانی حکومەتی هەرێم بە پسپۆڕ و کۆمپیوتەر بۆ ئەنجامدانی سەرژمێری گشتی دانیشتوانی کوردستان. خۆمان ئامادە کرد بو بچین بۆ ژاپۆن شەڕی یەکێتی و پارتی لە قەڵازەوە دەستی پێ کرد (1994/5/1) و بە خێرایی تەنیەوە بۆ رانیە و بادینان و سلێمانی. مام جەلال ئەبو بگەڕێتەوە بۆ کوردستان منیش، وەک مەسەلەیەکی ئەخلاقی، نەمئەتوانی خۆم لەم گەڕانەوەیە بدزمەوە ناچار لە رۆماوە لە گەڵی چومە سوریا و لەوێوە بۆ تورکیا و بە کۆپتەری تورکی راستەوخۆ بۆ هەولێر (1994/6/2). یەکێتی لە بادینان و پارتی لە سلێمانی دەرکرا بون. بەڵام هێشتا هەولێر پایتەختی حکومەتی هەرێم بە تێکەڵاوی بە دەست هێزەکانی یەکێتی و پارتیەوە بو.

زۆری ئەو ماوەیە من خەریکی گفتوگۆ بوم لە گەڵ نوێنەرانی پارتی. بۆ ئەو مەبەستە سەفەری ئێران و تورکیا و فەرەنسا و ئیرلەندەم کرد. بۆ ئاگادارکردنەوەی رای گشتی کورد لە رەوتی گفتوگۆکان چەندین وتارم نوسی و بڵاو کردەوە. لە ئاسۆی نزیکدا هەلی ئاشتبونەوەی یەکێتی و پارتیم نەئەبینی. هەلومەرجی ناو یەکێتییش " هەمان تاس و هەمان حەمام"ی جارەکانی تر بو.

نەمئەویست کێشەی ناوخۆ بۆ یەکێتی دروست بکەم دیسان بە بێدەنگی بۆم بە جێ هێشتن. بۆ ئەوەی دەنگی لێ دەرنەچێ هاوڕێ لە گەل مام جەلال بە ناوی بەشداری کۆبونەوەی تەداولی موعارەزەی

عیراقیەوە (اجتماعات تداولیە للمعارضە العراقیە) چوین بۆ تاران و دیمەشق. لەوێوە من گەڕامەوە بۆ لەندەن. لەوێ دانیشتم خۆم دور راگرت بو لە کاروباری یەکێتی. لەو ماوەیەدا لە نوسینەوەی "دیوی ناوەوەی روداوەکانی کوردستانی عیراق" لە ساڵی 1975 ەوە تا 1988 بومەوە و لە ژێر ئەم سەرناوانەدا بڵاوم کردنەوە:

- "لە کەناری دانوبەوە بۆ خڕی ناوزەنگ" هاوزەمان لە بەرلین و لە کوردستان لە لایەن دەزگای خاکەوە بڵاو کرایەوە. مستەفا ساڵح کەریم کردی بە عەرەبی و بە زنجیرە چەند بەشێکی لە هەفتەنامەی "الاتحاد" ا بڵاو کردەوە.
- "پەنجەکان یەکتری ئەشکێنن" هاوزەمان لە بەرلین لە لایەن ئاوەدانی و لە کوردستان لە لایەن دەزگای خاکەوە بڵاو کرایەوە.
- "خولانەوە لە ناو بازنەدا" هاوزەمان لە بەرلین لە لایەن ئاوەدانی و لە کوردستان لە لایەن دەزگای خاکەوە بڵاو کرایەوە. شێرزاد شێخانی کردی بە عەرەبی بەڵام لە بەر هۆی سیاسی ئەو کاتەی گفتوگۆی یەکێتی – پارتی بڵاوم نەکردەوە.

جگە لەمانە کە تێکەڵاو بون لە بیرەوەری و دۆکۆمێنت چەند کتێبی ترم ئامادە کرد لەوانە:

- "سەردەمی قەڵەم و موراجەعات" لە سلێمانی بە کوردی و محەمەد ساڵح گەلاڵی کردی بە عەرەبی و بڵاوکرایەوە.
- "میرایەتی بابان لە نێوان بەرداشی رۆم و عەجەمدا" لە هۆڵەندا و سلێمانی بڵاو کرایەوە.
- "لە پەراوێزی مێژوەکانی ئەردەڵاندا" لە سلێمانی بڵاوکرایەوە.

ئەو چەند جارەی لە لەندەن بوم مانەوەی خۆمم بە کاتی دانابو. ئەگەرچی چەند سەفەرێکم کرد بۆ سوید، ئەڵمانیا، هۆڵەندا، ئەمەریکا... بەڵام هەوڵم دا زۆرترین کەڵك لەو هەلە وەربگرم، بە تایبەتی بۆ نوسین. پێم وایە ئەو خزمەتەی لەو ماوەیەدا لە بواری نوسیندا بە رۆشنبیری و مێژوی کوردم کردوە هیچی کەمتر نیە لەو خزمەتەی، ئەگەر بە خزمەت بژمێردرێ، لە بواری سیاسی و پێشمەرگەییدا، کردومە.

*

لە دوای راپەڕینەوە بڕیارم دا بو، هەر کات لە گەڵ سەرکردایەتی یەکێتی توشی ناکۆکی قوڵ و کێشەی ئاڵۆزی سیاسی ببم ، لە باتی ئەوەی ململانێیان لە گەڵ بکەم، کە لەوانە بو ببێتە هۆی پێکدادانی چەکدار، لە بەردەمیان دا بە هێمنی و بێدەنگی بکشێمەوە. لە بەر ئەوە هەمیشە چاوەڕێ بوم لە هەلومەرجێکی گونجاودا بگەڕێمەوە کوردستان. سەرەنجام بڕیاری گەڕانەوەم دا. ئەم جارەیان کە بڕیاری گەڕانەوەم دا، یەکێتی لە هەولێر، پایتەختی هەرێم، دەرکرابو. حکومەتەکەی و مەکتەبی سیاسیەکەی و سەرکردایەتیەکەی و فەرماندەکانی بە ئاوارەیی لە سلێمانی بون.

## له لەندەنەوە بۆ قەڵاچوالان

دلێری سەید مەجید خێزانەکەی لە لەندەن ئەژیا هات بو بۆ سەردانی ئەوان و لە سەر گەڕانەوە بو. ڕێککەوتین پێکەوە بگەڕێینەوە. لە کۆتایی شوباتی 1999 دا لە فڕۆکەخانەی هیترۆ یەکمان گرتەوە و بەرەو تاران فڕین لە فرودگای میهراباد نیشتینەوە. لە ئوتێلێکی تاران دابەزین. ئەودەم بەهرۆز گەلاڵی نوێنەری یەکێتی بو لە تاران.

لە تاران بە پێویستم زانی ئیستێك بکەم. چونکە دەربارەی ڕۆیشتنەوەم بۆ کوردستان پێشتر ئاگاداری مام جەلال یا کەسێکی تری م س م نەکرد بو. خۆم سەربەخۆ بێ پرس و رای ئەوان بڕیاری گەڕانەوەم دا بو. گەڕانەوەی کتوپڕ و لە ناکاو لەوانە بو خراپ لێك بدرێتەوە. لەو سەردەمەدا پێشوازی کاربەدەستانی حیزب و حکومەت و کۆکردنەوەی فەرمانبەری فەرمانگەکان و خوێندکارانی زانکۆ و قوتابخانەکان و پێشمەرگە و کادرەکانی حیزب.. بوبو بە عادەت. لە گەڵ دلێر ڕێك کەوتم من لە تاران بمێنمەوە. ئەو بۆ گەیاندنی پەیامێکی من سەردانی مام جەلال بکا لە قەڵاچوالان. وەڵامی پەیامەکەم بۆ بهێنێتەوە بۆ تاران. ئەوسا بڕیار بدەم بڕۆمەوە بۆ کوردستان یان بگەڕێمەوە بۆ لەندەن.

پەیامەکەم ئەمە بو: من ئەگەڕێمەوە بۆ کوردستان. بە تەما نیم هیچ پلە و پایەیەك لە یەکێتی و لە حکومەتدا وەر بگرم. ئەمەوێ لە کوردستان بژیم و پشتیوانی ئەو ئەبم. نامەوێ پێشوازی حیزبی یا حکومەتی بکرێم. ئەمەوێ بە بێدەنگی بێمەوە. ئەگەر بەوجۆرە رازیە ئەگەڕێمەوە ئەگەرنا بلیتەکەم بۆ دوسەرە ئەگەڕێمەوە بۆ لەندەن. ناوەڕۆکی پەیامەکەم ڕەنگدانەوەی ناخی دڵم بو.

دلێر لە لای مام جەلالەوە هاتەوە تاران. وتی مام جەلال ئەڵێ وڵات وڵاتی خۆیەتی خۆی چۆن حەز ئەکا وا ئەکەین. بەڵام نە ئەوەی ئەو داوای کردوە و نە ئەوەی من بە تەمای بوم. کە هاتەوە با ماوەیەك میوانی من بێت.

دلێر حەزی بە گەڕانەوەی من و نزیکبونەوەی من بو لە مام جەلال. ئینجا پەیامەکەی منی چۆن بە مام جەلال گەیاند بو و پەیامەکەی مام جەلال چی بو بۆ من، وەکو خۆی برد بوی و هێنابوی، یان خۆیشی ترش و خوێی پێوە کرد بو، ئەوە مەگەر خۆی بزانێ. چونکە مام جەلال نامەیەکی بەخێرهاتنەوەی بۆ نوسی بوم ، لە گەڵ پەیامەکەی مندا هەندێ جیاواز بو. ئەمە دەقەکەیەتی:

برای دێرین و هەڤاڵی خۆشەویستم کاکە نەوەی بەڕێز

سڵاوێکی شۆڕشگێڕانەی گەرم

زۆر بە گەرمی بەخێرهاتنەوەتان دەکەم بۆ کوردستانی رزگار کە لە سەرەتای ژیانتەوە لەبۆی خەباتت کردوەو هیچیشت لە ژیان و خۆشی و فیداکاری لێ چاو نەبوە و لێت نەگرتۆتەوە. پڕ بەدڵیش شاد بوم و لە ناخی دڵەوە گەشامەوە، بەوەی کە بڕیارتان داوە لە پەنا و لە گەڵ برای

دێرینی خۆت درێژه بەو خەباتە بدەیتەوە کە هەمو لاوێتیت لە سەر داناوە، بە راستی یەکێك بووە لە خەبەرە هەرە خۆش و دڵشادکەرەکان.
زۆر بەخێر بێیتەوە سەر چاوان. بێگومان وەك هەمیشە کاکی خۆشت هاوخەبات و هاوکار و هاریکارت دەبێت و هیچیشی لێت چاونابێت. بەوپەڕی برایەتیەوە رێزی شایستەی خۆشت لێ دەگیرێت.
دوبارە بەخێربێیتەوەو هەر بژی بۆ
گەلەکەمان و یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان و
برای دڵسۆز و دێرینتان مام جەلال
1999 / 3 / 12
*
پاش ئەوەی دو حەفتە لە تاران مامەوە بە فرۆکە بە رێ کەوتم بۆ کرماشان. دیاری گەڵاڵی نوێنەری یەکێتی بو لە کرماشان. رۆژی 15 ی 3 ی 1999 لە کرماشانەوە بە ئۆتۆمۆبیل بۆ دەروازەی پەروێز خان و لە پەروێز خانەوە بۆ قەڵاچوالان، وەکو مام جەلال دای نابو.
رۆژی دوایی "کوردستانی نوێ" لە ژ 1823 ی رۆژی 16 ی 3 ی 1999 دا هەواڵەکەی بەم جۆرە گێڕایەوە:
"هەڤاڵ نەوشیروان گەیشتەوە سلێمانی
"پێش نیوەڕۆی 1999/3/15، سەعات 10 هەڤاڵ نەوشیروان مستەفا ئەندامی مەکتەبی سیاسی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان گەیشتەوە پەروێزخان و لەوێ بە ناوی هەڤاڵ مام جەلالەوە لە لایەن عومەر فەتاح و لە لایەن شێخ محەمەد شاکەلی بە ناوی مەکتەبی سیاسیەوە و لە لایەن هەڤاڵ جەلال جەوهەرەوە بە ناوی حکومەتی هەرێمەوە و هەڤاڵ نازم کەرکوکی بە ناوی هێزی پێشمەرگەی کوردستانەوە بە گەرمی بەخێرهاتنی لێ کرا.
"پاشان بە رێز و تەقدیرەوە بە رێ کران بەرەو قەڵاچوالان، لە عەربەتیش لە لایەن هەڤاڵ عومەری سەید عەلی و هەڤاڵ محەمەد تۆفیق و حاکم قادر حەمە جان و هەڤاڵ مەحمود سەنگاویەوە بە گەرمی پێشوازی لێ کرا.
"لە کاتی نیوەڕۆشدا کە گەیشتە قەڵاچوالان لە لایەن هەڤاڵ مام جەلال و هەڤاڵ د کەمال فوئاد و هەڤاڵانی تری مەکتەبی سیاسی و هەڤاڵ کۆسرەت رەسول عەلی سەرۆکی حکومەت و چەندین وەزیری کابینەکەیەوە بە گەرمی پێشوازی لێ کرا.
"پاشان هەمویان پێکەوە نانی نیوەڕۆیان لە سەر خوانی هەڤاڵ مام جەلال خوارد.
"هەمو هەڤاڵانی مەکتەبی سیاسی بە گەرمی پێشوازییان لە کاك نەوشیروان کرد و بە گەرمی بەخێرهاتنیان کرد هەڤاڵ مام جەلالیش بە ناوی ی ن ك و ە پ ك – ەوە زۆر بە گەرمی بەخێرهاتنەوەی هەڤاڵ نەوشیروانی خەباتگێڕی دێرین و ئەندامی کۆمیتەی دامەزرێنەری ی ن ك و فەرماندەی پێشمەرگەکانی کوردستان و ئەندامی دێرینی مەکتەبی

سیاسی ی ن ك کرد و هیوای خواست وەك هەمیشە هەمو هێز و توانا و هۆش و زانیاری خۆی لە پێناوی ئامانجە دێرینەکانی گەلەکەماندا بخاتە گەڕ."

*

ڕۆژنامەی کوردستانی نوێ نەیئەتوانی هەواڵی لەم بابەتە لە خۆیەوە، بێ ڕەزامەندی مام جەلال، بنوسێ. من نە نمایشەکەم پێ خۆش بو نە ئەو هەواڵە. حەزم ئەکرد وەکو خەڵکی ئاسایی چۆن بە بێدەنگی ڕۆیشت بوم بە بێدەنگی بگەڕێمەوە بۆ ئەوەی ئازادی قسە و کار و جموجوڵم هەبێ. چونکە ئەو نمایشە و ئەو هەواڵە، بە بێ ویست و ئارەزوی خۆم، جۆرێ لە "ئیلتیزام" ی سیاسی بە سەرمدا ئەسەپاند. دوای ئەوەی دو ڕۆژ لە قەڵاچوالان مامەوە ئیزنم خواست و گەڕامەوە بۆ سلێمانی.

*

## ململانێی ناو یەکێتی

مەکتەبی سیاسی پێك هاتوە لەم ئەندامانە:

کۆسرەت ڕەسول، جەبار فەرمان، عومەری سەید عەلی، قادری حاجی عەلی، ئەرسەلان بایز، عومەر فەتاح، محەمەد تۆفیق ڕەحیم، جگە لەمان کە پاشماوەی ئەندامە هەڵبژێردراوەکانی کۆنگرەی یەکەمی یەکێتی‌ین، فەرەیدون عەبدولقادر و عومەری حاجی عەبدوڵا، کە لە کۆنگرەی یەکەمدا وازیان هێنا بو، مام جەلال هێناونێتیەوە بۆ ناو م س. هەروەها:

شێخ محەمەدی شاکەلی، ڕەسول مامەند، لە دوای کۆنگرەی یەکەم مام جەلال لە ئەنجامی ڕێککەوتنێکی سیاسی‌دا لە گەڵ بەشێکی حیزبی سۆشیالیست دا هەردوکیانی هێناوەتە ناو م س. کاك ڕەسول کۆچی دوایی کرد. شێخ محەمەد ماوەتەوە.

مەلا بەختیار، عیماد ئەحمەد، لە دوای کۆنگرەی یەکەم مام جەلال لە ئەنجامی ڕێککەوتنێکی سیاسی‌دا لە گەڵ بەشێکی حیزبی زەحمەتکێشان هەردوکیانی هێناوەتە ناو م س.

بەندەش، کە لە کۆنگرەی یەکەم دا لە سەر داوای مام جەلال، لە گەڵ د فوئاد مەعسوم و د کەمال فوئادا بێ ئەوەی بە فیلتەری هەڵبژاردندا تێ بپەڕین، بە بیانوی ئەوەی لە دەستەی دامەزرێنەر بوین، بۆ ئەندامەتی سەرکردایەتی بە چەپڵەڕێزان هەڵبژێردراین.

مام جەلال زیرەکانە مەکتەبی سیاسی داناوە. ئەوانە چەند دەستەبەند و کەسایەتی جیاوازن بە دەگمەن هەمویان لە سەر کێشەیەك ئەتوانن پێك بێن. هەمیشە پێویستیان بە مام جەلال ئەبێ بۆ ئەوەی هاوسەنگی‌یان لە نێواندا ڕابگرێ. ئەگەر ئەو نەبێ ڕەنگە نەتوانن ئێوارەیەك، لە هیچ بۆنەیەک دا شایی بێ یا شیوەن، پێکەوە کۆ ببنەوە.

کۆسرەت و جەبار ناکۆکن. هەر کەسەیان داروەدستەی خۆی هەیە. هەرکەسەیان ئەیەوێ پێگەی خۆی بەهێز و ئەوی تر لاواز بکا. کۆسرەت کار ئەکا بۆ ئەوەی هەروەك کەسی یەکەمی حکومەتە، ئاوەهاش ببێتە کەسی یەکەمی یەکێتی.

کەمال فوئاد و فوئاد مەعسوم و عومەر فەتاح و ئەرسەلان بایز، شێخ محەمەدی شاکەلی و مەلا بەختیار و عیماد ئەحمەد، لە ناو رێکخراو و کادرەکانی یەکێتی‌دا پێگە و پشتیوان و لایەنگریان کەمە. مام جەلال دەستی گرتون و ئەوانیش دەستیان بە مام جەلالەوە گرتوە، لە هەمو شتێك دا پشتی ئەگرن.

کۆسرەت و جەبار پیێان وایە من لە سەر داوای مام جەلال و بۆ پشتیوانی لەو لە بەرامبەر ئەواندا هاتومەتەوە و، ئەو چەند رۆژەی میوانی ئەو بوم لە قەڵاچوالان خەریکی دانانی نەخشە و پیلان بوین دژی ئەوان. زۆر بە توندی کەوتنە دژایەتی من. راستیەکەی ئەوان خۆیان بەدگومان بون ئەگینا ئەو چەند رۆژە هیچ باسێکی سیاسی‌مان نەکرد بو، هیچ نەخشە و پیلانێکیشمان دانەنا بو دژی ئەوان. مام جەلال ئامادە نەبو دژی ئەوان کار بکا یا لە هیچ هەلومەرجێك‌دا دەستیان لێ هەڵ بگرێ یا تەنانەت ئەو شتانەیان بە رودا بداتەوە. لە یەکەمین کۆنگرەی گشتی یەکێتی‌دا ئەوان دژی من پشتیوانی‌یان لە مام جەلال کرد. ئەویش بۆ ئەوەی من لە ناو یەکێتی‌دا لاواز بکا خۆی هەردوکیانی گەورە کرد بو. دەسەڵات و پارەی خست بوە بەردەستیان. ئازاد و ئازای کرد بون چی ئەکەن بیکەن. بۆ راگرتنی هاوسەنگیی ناو یەکێتی پێویستی بە هەردوکیان و هەردو دەستەبەندیەکەیانە.

ئەوەی گومانی لە لا دروست کردبون ئەوەبو گەڕانەوەی من هاوزەمان بو لە گەڵ زنجیرەیەك کۆبونەوە کە مام جەلال لە رۆژانی 22 تا 28 ی مانگی شوبات، دەربارەی "گەشەپێدان و بژارکردن" ی یەکێتی، بە مەکتەبی سیاسی کرد بو. ئەوی راستی بێ من هیچ ئاگایەکم لەم کۆبونەوانە نەبو. گەڕانەوەی منیش هیچ پێوەندیەکی بە گەشەپێدان و بژارەوە نەبو. بۆ زیاتر ئاگاداری لێرەدا هەواڵی کۆبونەوەکانی م س لەو رۆژانەدا دەقاودەق وەکو لە رۆژنامەی کوردستانی نوێدا نوسراوە رائەگوێزم. ئەوەندەی بزانم هەواڵەکان لە لایەن خودی مام جەلالەوە ئامادە کراون و دوا هەواڵیشیان هەر لە لایەن خۆیەوە داڕێژراوە:

*

هەواڵی یەکەم: کوردستانی نوێ: ژ 1808 رۆژی 23 ی 2 ی 1999.

"لە کۆبونەوەیەك‌دا بە سەرپەرشتی سکرتێری گشتی مەکتەبی سیاسی بڕیاری دا پێداچونەوەیەکی گشتی بە هەمو دەزگاکانی ی ن ك بکرێ

"پاش نیوەڕۆی دوێنێ 22 ی 2 هەڤاڵ مام جەلال، لە قەڵاچوالان سەرپەرشتی کۆبونەوەیەکی ئاسایی مەکتەبی سیاسی یەکێتی‌ی نیشتمانی‌ی کوردستان – ی کرد.

"لە کۆبونەوەکەدا باس لە رەوشی سیاسی ئەمرۆی کوردستان و عیراق و ناوچەکە و دوا پێشهاتەکانی پرۆسەی ئاشتی لە کوردستاندا کرا.

"لە تەوەرەیەکی تری کۆبونەوەکەدا کە تایبەت بو بە رێکخستنەوەی هەمو دەزگاکانی ناو ی ن ك، بڕیار لە سەر پێداچونەوەیەکی گشتی درا، کە لە سەر بناغەی هەڵبژاردنی هەمو دەزگاکان دامەزرا بێت لە خوارەوە بۆ سەرەوە."

*

هەواڵی دوەم: کوردستانی نوێ: ژ 1809 رۆژی 24 ی 2 ی 1999.

"بە سەرپەرشتی مام جەلال مەکتەبی سیاسی درێژە بە کۆبونەوە ئاساییەکانی دەدا

"ئێوارەی دوێنێ 23 ی 2 هەڤاڵ مام جەلال لە بارەگای مەکتەبی سیاسی لە قەڵاچوالان سەرپەرشتی کۆبونەوەیەکی ئاسایی مەکتەبی سیاسی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان – ی کرد.

"لە کۆبونەوەکەدا باس لە رەوشی سیاسی ئەمرۆی کوردستان و عیراق و ناوچەکە و دوا پێشهاتەکانی پرۆسەی ئاشتی لە کوردستان کرا.

"لە تەوەرەیەکی تری کۆبونەوەکەدا درێژە بە باس کردنی رێکخستنەوەی دەزگاکانی ی ن ك و چۆنیەتی گەشەپێدانیان درا، واش بڕیارە کۆبونەوەکان لە رۆژانی داهاتوشدا درێژەیان هەبێت."

هەواڵی سێیەم: کوردستانی نوێ: ژ 1811 رۆژی 28 ی 2 ی 1999.

"لە درێژەی کۆبونەوەکانیدا بۆ گەشەپێدان و بژارکردن مەکتەبی سیاسی چەندین بڕیاری گرنگی بۆ گەشەپێدانی هێزی پێشمەرگەی کوردستان دەرکرد."

*

هەواڵی چوارەم: کوردستانی نوێ: ژ 1812 رۆژی 1 ی 3 ی 1999.

"لە درێژەی کۆبونەوەکانیدا مەکتەبی سیاسی بڕیاری دا لە هەفتەی داهاتووەوە دەست بە بژارکردن و گەشەپێدانی دەزگاکانی حکومەت بکرێ

"مەکتەبی سیاسی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان لە درێژەی کۆبونەوەکانی خۆیدا بە سەرپەرشتی هەڤاڵ مام جەلال بۆ گەشەپێدان و بژارکردن لە ناو یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان وهێزی پێشمەرگەی کوردستان و حکومەتی هەرێم و رێکخراوە دیمۆکراتیەکاندا، کۆبونەوەی دوێنێ 28 ی 2 ی تەرخان کرد بۆ حکومەتی هەرێمی کوردستان.

"لەم بوارەدا مەکتەبی سیاسی باسی لە گەشەپێدان و بژارکردن لە حکومەتی هەرێمی کوردستاندا کرد و بڕیار درا لە سەرەتای هەفتەی داهاتووەوە دەست بکرێ بە بژارکردن و گەشەپێدانی دەزگاکانی میری خۆمان و دانانی میلاکات بۆ وەزارەتەکان و هەڵبژاردنی خەڵکی شایستە بۆ شوێنی خۆیان.

"هەروەك بڕیار درا حکومەت کارە خزمەتگوزارییە

ئەنجامدراوەکانی خۆی بۆ کۆمەڵانی خەڵك رون بکاتەوە و دەزگا پێویستیەکان بۆ گەشەکردن و هەڵسوڕاندنی کاروبارەکانی پێویستیش دابمەزرێنێت.

"هەروەها بودجەی میریی خۆشمان رێکوپێکتر دابندرێتەوە و پلانی راستوڕەوا بۆ گومرگ و باجە جیاجیاکان دابندرێت و هەوڵ بدرێت لە بنەڕەتەوە، دزی و راووڕوت و بەرتیل خواردن و زێدەمەسرەفی لە ناو دەزگاکاندا نەهێڵدرێ."

*

خۆزگە کەسێک ئەم هەواڵانە و وتارە درێژەکانی مام جەلالی شی ئەکردەوە و هەڵی ئەسەنگاندن و، بەراوردی ئەکردن لە گەڵ روداوەکانی سەرئەرز تا دەرئەکەوت لەو بڕیار و بەڵێنانە چەندیان جێبەجێ کراون و، چەندیان هەر قسەی روت بون و هەرزو پشت گوێ خراون و لە بیر چونەتەوە.

## 2. هەوڵی ریفۆرم

### ناڕەزایی خەڵک

لەوەتی هاتومەوە ژمارەیەکی زۆر لە خەڵکی ناوچە جیا جیاکانی کوردستانی عیراق، هەر لە ئاوارەکانی زاخۆ و هەولێرەوە تا سەرۆکی عەشیرەتەکانی کفری هاتونەتە لام، ئەگەرچی هەمویان بە ناوی بە خێر هاتنەوە هاتون بەڵام هەمویان کەم و زۆر ناڕەزایی دەرئەبڕن، باس لە چاککردنی هەلومەرجی کوردستان ئەکەن. بە گشتی هیوایەکی زۆریان هەیە من دەورێکی کاریگەر بگێڕم لە چاککردنی باری وڵاتدا.

لە ناو ئەوانەدا کە بینیومن: بزوتنەوەی ئیسلامی، عەلی باپیر، شێخ محەممەدی بەرزنجی، محەممەد بابان و مەڵبەندی سلێمانی، هەردو وەزیری ئەوقاف و عەدل. نەهزەی ئیسلامی. محەممەدی حاجی مەحمود و عەبدولخالق هەورامی و سۆسیالیستی دیموکراتی. قادر عەزیز و زەحمەتکێشان. سورچیەکان و پارێزگاران. بەهادین نوری و دیموکراتیخوازان. بەختیار زەنگەنە و کۆمەڵەی نەتەوەیی. حیزبی شیوعی کوردستان. کۆمۆنیستی کرێکاری.

ناڕەزایی خەڵك لەوانە ئەندام و کادر و پێشمەرگەکانی یەکێتی لە سەر چیە؟ چیە ئەوەی کەمایەسی تێ کەوتوە و پێویستی بە ڕاست کردنەوە هەیە؟ ئەیانەوێ چی چاك بکرێ؟ ئەگەر چەوتی و خوار و خێچییەك هەبێ لە کوێ دایە؟ ئەبێ لە کوێ وە دەس بە ڕاستکردنەوە بکرێ؟

کەوتمە دوی دۆزینەوەی وەڵامی ئەم پرسیارانە و میکانیزمی جێبەجێ کردنیان. لە گەڵ شارەزایانی وەزارەت و دائیرەکان و پسپۆڕی بواری جیاوازی کارگێڕی و بەڕێوەبەرایەتی گفتوگۆم کرد. هەوڵم دا زۆرترین زانیاری کۆ بکەمەوە، خەلەلەکان دیاری بکەم، هەوڵی دۆزینەوەی چارەسەر بدەم.

## گفتوگۆیەکی دوقۆڵی

9 ی 4 ی 1999 هەینی:

نیوەڕۆ بۆ فراوین بە کۆمەڵ، مام جەلال و زوربەی ئەندامانی م س میوانی کۆسرەت بوین. دوای هاتنەوەم بۆ سلێمانی ئەوە یەکەمین جار بو لە گەڵ مام جەلال یەکتری ببینینەوە.مام جەلال وتی: بۆ بەخێرهاتنەوەت و بۆ ئەوەی هەندێ قسە بکەین ئێوارە دێم بۆ سەردانت.

ئێوارەکەی هات و بە دو قۆڵی لە ماڵەکەی خۆمان دانیشتین. لە دوای گەڕانەوەم بۆ کوردستان ئەمە یەکەمین جار بو پێکەوە بۆ باسی سیاسی کۆ ببینەوە.

وتی: "ئەوە چەند رۆژێکە گەڕاویتەوە سلێمانی، حەساویتەوە، خەڵکی زۆرت بینوە، ئیستا ئەڵێی چی؟"

وتم: "ئەو ماوەیەی هاتومەوە زۆر کەس هاتون بۆ لام، بواری کەسم نەداوە ماڵەکەم بکا بە دیواخانی هێرش بۆ سەر یەکێتی و سەرکردەکانی، بەڵام هەندێ شتم لە قسەکانیان دەرهێناوە. شوێنی تۆ لە ناو خەڵك دا بەهێزە و چاوەڕوانی ئەوەن ئەو بڗارەی دەستت پی کردوە بە ئەنجامی بگەیەنی. ئەوەی من بۆم ساخ بۆتەوە خەڵك لە دو شت زۆر نارازین:

یەکەمیان، ئەو جیاوازییە گەورەیەی لە نێوان ژیانی کاربەدەستانی یەکێتی و خەڵك دا هەیە.

دوەمیان، ئەو فەسادە زۆرەی لەم حکومەتەدا دروست بوە، هیچ ئیشێ بێ واسیتە و مەحسوبیەت، ناڕوا. فەساد لە سەرکردایەتی یەکێتی دایە، ئەگەر هەمو کادرەکانی ناوەڕاست و خوارەوەش لابرێ ئەگەر دەسکاری سەرەوە نەکرێ هیچ سودێکی نیە. خەڵك ئەپرسن:

مام جەلال خۆی دز نیە ئەی بۆچی دزی لەمانە قبوڵ ئەکا؟

مام جەلال خۆی داوێنپیس نیە ئەی بۆچی داوێنپیسی لەمانە قبوڵ ئەکا؟

مام جەلال خۆی پیاوێکی قانونیە بۆچی بێ قانونی لەمانە قبوڵ ئەکا؟

تۆ کەسی یەکەمی، ئۆباڵی مێژویی لە ئەستۆی تۆدایە، ئەگەر حوکمڕانی یەکێتی باش و سەرکەوتو بێ پاشەڕۆژ ستایشی تۆ ئەکەن و ئەگەر خراپ و شکستخواردو بێ قسە بە تۆ ئەڵێن..."

پێشتر چەند جارێ بەر لەوەی کوردستان بە جێ بهێڵم و دوای ئەوەش چەند جارێ لە ئەوروپا بە راشکاوی ئەم بابەتانەم لە گەڵ باس کرد بو، هەمو جار بەڵێنی چاککردنی ئەدا بەڵام هیچ جارێ بە جێی نەئەهێنا.

قسەکانی منی بە دڵ نەبو، حەزی نەئەکرد باسی لایەنە رەشەکانی دەسەڵاتی یەکێتی ببیستێ، حەزی ئەکرد باسی دەسکەوت و سەرکەوتن و لایەنە باشەکانی بۆ بکەم، لە گەڵ ئەوەشدا قسەکانی سەلماند.

وتی: "هەقیانە، تۆش یارمەتیم بدە وەرە بۆ کۆبونەوەکانی م س، چاکیان ئەکەم."

وتم: "ئەگەر تۆ چاکی بکەی من سەرباز ئەبم لە لەشکرەکەدا."

وتی: "تۆ سەرباز نابی جەنەراڵ ئەبی."

کوێر تا ئەمرێ بە تەمای چاوە. منیش ئومێدێکم لە لا زیندو بوەوە، ئەگەرچی زۆر کز و لاواز بو، بەڵام ئومێد بو. پیرەمێرد ئەڵێ: "شەوێ پیاوێ لە بەفرا ما، نەمرد، ئاگرێکی دوری دی..."
*

**پاشاگەردانی هەرێمگیر**

سیستەمی کاری حکومەتی و حیزبی و پێشمەرگەیی لە قەڵەمڕەوی یەکێتیدا بە جۆرێ رێك خراوە هەر لایە بۆ خۆی شتێکی سەربەخۆیە لەوی تر.

کۆسرەت سەرۆکی حکومەت و دەسەڵاتداری یەکەمی ناو حکومەتە.

جەبار فەرمان جێگری فەرماندەی گشتی پێشمەرگەیە، بەڵام دەسەڵاتداری یەکەمی ناو پێشمەرگە خۆیەتی.

مەکتەبی سیاسی قەوارەیەکی روکەشە، پێك هاتوە لە چەند ئەندامێکی بێکار و، چەند بەرپرسی مەکتەب و چەند وەزیرێ.

وەزیرەکان لە کۆبونەوەی ئەنجومەنی وەزیران دا لە کاروباری وەزارەتەکانی یەکتری ناپرسنەوە و هەقیان بە سەر یەکتریەوە نیە.

ئەندامانی م س لە کۆبونەوەکانی م س دا لە کاروباری مەکتەبەکانی یەکتری ناپێچنەوە هەقیان بە سەر یەکتریەوە نیە.

لە سەرو ئەمانەوە کەسێ یا دامەزراوێ نیە هەمویان بە یەکەوە گرێ بدا و لە کاروبارەکانیان بپرسێتەوە.

مام جەلال، سکرتێری گشتی، کە بە پێی پێڕەوی ناوخۆ بەرپرسی هەمویانە، بە زۆری خەریکی سەفەری دەرەوە و بازرگانی و قۆنتەرات و لیوا تایبەتیەکانی خۆی و کۆبونەوەی فراوانی بێ سودی بەردەم شاشەی تەلەفزیۆنە.

داهاتی حکومەت لە تاریکی تەواو دایە جگە لە کۆسرەت و وەزیری دارایی و چەند کارمەندێکی پێوەندیدار کەسی کە نازانێ چەندە و چی لێ ئەکرێ و چۆن سەرف ئەکرێ.

بە فیرۆدانی دارایی گشتی و پێڕەوی نەکردنی پێوانەی قانونی لە دابەشکردنی وەزیفە و پارە و زەوی و خانو و، پێڕەوی نەکردنی یەکسانی لە رەفتارکردن لە گەڵ هاوڵاتییاندا بۆتە دیاردەیەکی زەق و دزێوی گەندەڵی بەڕێوەبەرایەتی:

- هەزاران کەس دامەزرێنراون بێ ئەوەی دائیرەکانی حکومەت پێویستی پێیان بێ. هەزارانیان "بەدەر لە رێنماییەکان" واتە بێ ئەوەی مەرجی قانونییان تێدا بێ و بە سەدانیان بە "شەهادەی ساختە" بە پلەی تایبەتی و بەرز دامەزرێنراون.

- سەدان خانوی حکومەتی، کە هەندێکیان خانوی وەزیفەن، دراوە بە کەسانی ناموستەحەق و زۆری تاپۆ کراوە لە سەریان یا فرۆشتویانەتەوە.

- قۆنتەرات دراوە بە کەسانێ کە نە بەڵێندەرن و نە بازرگانن. هەندێ لەمانە قۆنتەراتەکان ئەفرۆشنەوە. لە بەر ئەوەی قۆنتەراتەکە دەستاودەست ئەکا و هەرکەسە بەشە قازانجی خۆی لێ وەرئەگرێ. چۆنایەتی پرۆژەکان خراپ و هەندێکی تەواو ناکرێ.

- هەزاران پارچە زەوی دابەش کراوە بە سەر کەسانی جۆراوجۆردا، بە ناوی پێشمەرگە و کادر و تێکۆشەری دێرین و کەسوکاری شەهید... هەندێکیان بە درۆ ئەو ناوەیان لە خۆیان ناوە و، هەندێکیان خانویەك و پارچەیەك زەوی یا زیاتر و هەندێك بە

ناوی خۆی و هاوسەر و منداڵەکانیەوە چەندین پارچە زەوییان وەرگرتوە و فرۆشتویانەتەوە.

- سەدان ملیۆن دینار ئەدرێ بەموبەو و سەدان ئۆتۆمۆبیل بۆ ئەموئەو ئەکرِدرێ بێ ئەوەی هیچ لێپرسینەوە یا چاودێریەکی دارایی بە دواوە بێ.

- دەستی گەندەڵی گەیشتۆتە دەزگا زانستی و قەزاییەکان.

بە سەدان خوێندکار "بەدەر لە رێنماییەکان" لە کۆلێجەکانی زانکۆی سلێمانی و لە خوێندنی باڵای بواری جۆراوجۆر بە "قبول خاص" وەرگیراون و، راگری کۆلێج و سەرۆکی بەشەکان بێ گوێدانە پێوەری زانستی و قانونی دائەنرێن و لائەبرێن.

بە دەیان دادوەر و جێگری داواکاری گشتی، بێ ئەوەی مەرجە قانونیەکانیان تێدا بێ، لە دادگا و دائیرەکان‌دا دامەزرێنراون.

لەم پاشاگەردانیەدا کە مام جەلال ناوی ناوە "تەخشان و پەخشان" گوێ نەدراوەتە یەکسانی هاووڵاتی‌یان، تەنانەت یەکسانی ئەندامانی یەکێتی، هەموی لە سەر بنچینەی مەحسوبیەت و مەنسوبیەت بۆ کرِینی دڵسۆزی و گوێرِایەڵی سودمەندەکانە.

*

ئەو سیستەمی کارەی سەرۆکی حکومەت، کە تەنیا سەرۆکی دەسەڵاتی کارگێرِی و جێبەجێ کردنە، لە ماوەی 7 ساڵ سەرۆکایەتی ئەنجومەنی وەزیران‌دا، دایهێناوە، بناغەکانی بە جۆرێ دارِشتوە، گەندەڵی (مەحسوبیەت، مەنسوبیەت، بەدبەکارهێنانی دەسەڵاتی کارگێرِی ودارایی حکومەت بۆ قازانج و ئارەزوی تایبەتی) کردوە بە نەریتێکی ئاسایی و قانونیی بەرِێوەبردنی داوودەزگاکانی حکومەتی هەرێمی کوردستان – ئیدارەی سلێمانی.

*

حەفتەی چەند جارێ لە گەڵ کۆسرەت یەکتر ئەبینین. پێکەوە ئەچین بۆ گەرِان و پیاسە و سەردان. چەند جارێ قسەم لە گەڵ کرد، باسی نارِەزایی خەڵك و خراپی شێوەی کاری حکومەتەکەیم بۆکرد. شتی وا نەك ناسەلمێنێ، بەڵکو زۆری پێ ناخۆشە باسی ئیسلاح و چاککردن و ریفۆرمی دەزگای کارگێرِی و رێکخستنەوەی ناو ماڵی یەکێتی و حکومەتی هەرێمی لە گەڵ بکەی. پێی وایە هەمو قسەیەکی لەو بابەتە دژایەتیە لە گەڵ ئەو و هەر چاکسازیەك لە هەر دەزگایەك‌دا بکرێ پیلانگێرِانە لە دەسەڵاتی ئەو.

*

**نامە بۆ مام جەلال**

28 ی 5 ی 99:

زۆر جار کە دەربارەی هەندێ مەسەلەی گرنگ لە گەڵ مام جەلال قسەم ئەکرد داوای لێ ئەکردم رەئی خۆمی بە نوسین بۆ بنێرم بە تایبەتی چونکە من زو زو نەمئەبینی. دوای ئەوەی نائومێد بوم لەوەی بە هاوکاری لە گەڵ کۆسرەت هیچ چاکسازیەك بکرێ پەنام بۆ مام جەلال برد و ئەم نامەیەم بۆ نوسی:

برای گەورە و بەرِێزم مام جەلال

سڵاوێکی گەرم

هیوادارم هەر لە خۆشی دا بی

لام وایە خۆت لە هەمو کەس چاکتر ئاگاداری کاروبارەکانی ناو دەرونی یەکێتی و حکومەتی هەرێمی و، ململانێی ناڕەوا و نادروستی دەستە و تاقم و کەسانێکی جۆراوجۆر ئەبیستیەوە، بێگومان ئەمەش کارێکی خراپ ئەکاتە سەر نفوز و دەسەڵاتی یەکێتی و، لە ململانێی ستراتیجی دا لە گەڵ پارتی لە لایەك و لە گەڵ بەعس لە لایەکی ترەوە لە ئێستا و لە پاشەڕۆژدا لاواز و بێ هێزی ئەکا. جێگەی داخە زۆری سەرکردە و کادرەکانی یەکێتی بەربونەتە گیانی یەکتری و، بەشێکی گرنگی تواناکانیان لەم پێناوەدا بە فیڕۆ ئەدەن. بۆیە بە پێویستم زانی بۆ دەرچونێکی سەلامەت لەم گیروگرفتە نالەبارە هەندێ بیروبۆچونی خۆمتان عەرز بکەم. هیوادارم کەڵکێکی هەبێ.

1. هۆی سەرەکی ئەو کەموکوڕییانەی دروست بون بە بۆچونی من ئەگەڕێتەوە بۆ: یەکەم، لێ نەپرسینەوە و محاسەبە نەکردنی هیچ کاربەدەست و بەرپرسێ، لە سەر هیچ لادانێ تەنانەت لە سەر هیچ تاوانێ، لە هیچ ئاستێکی بەرز یان نزم دا، ئەمەیش جۆرێ لە لادان و پاشاگەردانی خوڵقاندوە، هەلپەرست و مشەخۆرەکان بە ئارەزوی خۆیان کەڵکیان لێ وەرگرتوە. دوەم، نەبونی ناوەندێکی یەکگرتوی بڕیاردان. دەزگا گرنگەکان هەر یەکەیان بە پێی بۆچونی خۆی بڕیار ئەدا، لە بەر ئەوە زۆر جار نەك هەر هاوئاهەنگ نابن و تەواوکەری یەکتری نابن، بەڵکو تەگەرە لە کارەکانی یەکتر ئەدەن.

پێم وایە چارەسەر کردنی ئەم گیرۆگرفتانەش شتێ نیە لە کردن نەیەت بەڵکو کارێکی ممکن و پێویستە بۆ ڕێکخستنەوەی کاروبارەکانی ناو یەکێتی و، گێڕانەوەی گیانی هاوکاری و تەبایی و ڕێزگرتنی یەکتری و، یەکێتی بیر و کار بۆ ڕیزەکانی.

لەم ڕوانگەیەوە بە پێویستی ئەزانم پێشنیارەکانی خۆمت بۆ بنوسم.

2. دەزگا گرنگە حکومەتی و حیزبیەکانی ئێستای یەکێتی بریتین لە: وەزارەت، مەکتەبی سیاسی، فەرماندەیی هێزی پێشمەرگە، مەکتەبی ڕێکخستن، مەکتەبی ڕاگەیاندن، ڕێکخراوە دیموکراتیەکان.

3. بۆ ئەوەی هەمو ئەم دەزگایانە لە ڕاپەڕاندنی ئیشوکارەکان دا هاو ئاهەنگ بن و، بە ڕێکوپێکی کارەکانیان ئەنجام بدەن چاك وایە هەمو حەفتەیەك یان دو حەفتە جارێك خۆت کۆبونەوەیەکیان لە گەڵ بکەیت بە هەمو کارەکانیان دا بچیتەوە و تەعلیماتی پێویستیان بدەیتێ و بەرنامەی کاری ڕۆژانی داهاتویان بۆ دیاری بکەیت و، لە کۆبونەوەی داهاتودا لێیان بپرسیتەوە کە ئاخۆ ئیشەکان چەندی جێبەجێ کراون و چەندی جێبەجێ نەکراون.

4. ئامۆژگاری و هەڕەشە و توڕەبون بە تەنیا بەس نین بۆ ئەوەی کاروبارەکان ڕاست بکرێنەوە، بەڵکو ئەبێ هەندێ ئیجرائاتی قانونی و حیزبیشیان لە گەڵ بێ، وەکو لابردن و دابەزاندن و گوێزانەوە و جێ پێگۆڕین و، لە هەندێ حاڵەتی تایبەتی دا دران بە مەحکەمەی حکومەتی.

5. ئامۆژگاری و ئیجرائاتەکان چەندی بە هێمنی و بە بێ توڕە بون ئەنجام بدرێن باشتر و کاریگەرتر ئەبێ.

6. ئەم کۆبونەوانە چەند ئەنجامێکی باشیان ئەبێ، لە پێش هەمویانەوە کۆکردنەوەی دەسەڵاتەکانی بەڕێوەبردن و بڕیاردان و سزادان لە یەك دەس دا و یەکخستنەوەی سەرچاوەکانی فەرمان و ئامۆژگاری و تەعلیمات لە یەك سەرچاوەدا، لە ئەنجامی ئەمەش دا ئەم دەزگایانە ئیتر ناتوانن پێچەوانەی یەکتری کار بکەن و کار لە

یەکتری تێك بدەن، بەڵکو ئەوسا وەکو چەند تیپێکی یەك لەشکر بۆ جێبیەجێ کردنی یەك ئامانج کار ئەکەن.

لە کۆتایی دا سەرکەوتنت بە ئاوات ئەخوازم

لە گەڵ ڕێزی بێئەندازەی دڵسۆزتان: نەوشیروان

سلێمانی 28 مایسی 1999

*

لەو ماوەیەدا بە سەدان کادری ڕێکخراوەیی و پێشمەرگەیی و حکومەتی هاتون بۆ لام گلەیی لە یەکێتی ئەکەن، ناڕەزایی دەرئەبڕن، ئەپرسن چی بکەین؟ زۆر بە کورتی جوابم داونەوە: لەم ململانێ چەند قۆڵیەدا پشتیوانی لە مام جەلال بکەن!

*

**گیروگرفتی فایز!**

15 ی 4 ی 99:

دوای بڵاوکردنەوەی ڕێککەوتننامەی واشینتۆن حکومەتەکەی سلێمانی چەند هەزار کەسێکی لە دائیرەکانی دا دامەزراندوە، ئێستا لە بەر ئەوەی پارە نیە بیاندەنێ و جێگە نیە لێیان دابنێن، بە ناوی فایز (فائض) ەوە ئەیانەوێ ژمارەی موچەخۆرەکان کەم بکەنەوە. شتێکی تازەیان بە ناوی هێزی کارەوە دروست کردوە، فایزەکانی بۆ ئەنێرن.

ئەو کاتەی ئەمانیان دامەزراندوە گوایە بە هیوا بون پارتی هەمو مانگێ 10 ملیۆن دینار پارەیان بداتێ و ئەمانیش بیکەن بە "موچە" ی ئەم تازە دامەزراوانە. ڕەنگە هۆی ڕاستیەقینەی ئەمەش ئەوەبێ لە گفتوگۆکانی واشنتۆندا پارتی داوایان کردوە جێگۆڕکێ بکرێ بە سەرۆکی حکومەت و سەرۆکی پارلەمان. لە دوای یەکەمین هەڵبژاردنی کوردستان، ڕێك کەوتبون سەرۆکی حکومەت لە یەکێتی بێ و سەرۆکی پارلەمان لە پارتی. پارتی پێیان دائەگرت کە ئەبێ سەرۆکایەتی حکومەت بدرێ بەوان.

سەرۆکی حکومەتەکەی یەکێتی لە سلێمانی باوەڕی کرد بو لە هەر ڕێککەوتنێکی داهاتودا خۆی لە سەرۆکایەتی حکومەتدا نامێنێ بۆ ئەوەی لە لایەکەوە بیکا بە پیاوەتی خۆی کە ژمارەیەکی زۆر هاوڵاتی بێ دەرامەتی دامەزراندوە و موچەی بۆ دابین کردون، لە لایەکی ترەوە کێشەیەکی دژوار بۆ سەرۆکی داهاتوی حکومەت ئەخوڵقێنێ. ئیستا کە حکومەت یەکی نەگرتۆتەوە و خۆی لە سەرۆکایەتی حکومەتدا ماوەتەوە و، ئەو 10 ملیۆن دینارەش کە بە پێی ڕێککەوتنی واشنتۆن، پارتی ئەبو مانگانە بیدا بە یەکێتی نای دا، کێشەکە دوچاری خۆیان بوتەوە.

ئێستا بە ناوی فایزەوە ئەوی واسیتە و پشتیوانی هەبێ ئەگەر تازە و بێ شەهادەش بێ لە دائیرەدا ئەهێڵرێتەوە و ئەوی بێ واسیتە و پشتیوانیش بێ ئەنێردرێ بۆ هێزی کار، بە واتەیەکی تر دەرئەکرێ. دوێنێ دو کەس هات بون واسیتەیان بۆ بکەم بیانگێڕنەوە سەر کارەکانی خۆیان، یەکێکیان 23 ساڵە (مدقق مالی) ە کراوە بە فائیز و یەکێکی تازەیان لە جێگە داناوە شەهادەی سەرەتایی هەیە.

## داهاتی هەرێم و دابەشکردنی

ئەمویست بزانم داهاتی کوردستان چەندە؟ سەرچاوەکانی چین؟ چۆن سەرف ئەکرێن؟

حکومەتی هەرێمی کوردستان بودجەی ساڵانە یا مانگانەی نیە. پشت بە داهاتی ڕۆژانە ئەبەستێ و بەو پێیە موچەی فەرمانبەران ئەدا و پارەی یارمەتی بۆ ئەم و ئەو سەرف ئەکەن.

هیچ کەس و هیچ دەزگایەك نیە لە سەرو سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیرانەوە بە حسابات دا بچێتەوە بزانێ چۆن سەرف ئەکرێ.

سەرۆکی ئەنجومەن سەقفێکی دیاری کراوی نیە بۆ سەرفی پارەی ڕۆژانە و مانگانە، خۆی ئازادە.

لە هەمو بازگە سەرەکیەکانی گومرگدا لە سەر سنورەکان دوای کۆکردنەوەی داهاتی گومرگ بەر لەوەی پارەکە بگوێزرێتەوە بۆ بانك شتێکی داهێناوە بە ناوی (صرف خاص) بە پسوڵەی تایبەتی پارەکەی بۆ سەرف ئەکرێ بێ ئەوەی بچێتە حسابی بانك یان حکومەتەوە.

هەروەها لەو پارەیەش کە ئەچێتە بانکەوە و ئەخرێتە بەردەس وەزیری داراییەوە بەشێکی لە لایەن سەرۆکی وەزیرانەوە بە پسوڵەی تایبەتی بێ هیچ ڕونکردنەوەیەکی هۆی سەرفی، سەرف ئەکرێ.

*

6ی 6ی 99:

سەر لە بەیانی ئەمڕۆ لە گەڵ کۆسرەت یەکترمان بینی. پرسیاری جۆری دابەشکردنی داهاتم لێ کرد. وتی:

| | |
|---|---|
| 30% | بۆ ئیدارەی گشتی واتە بۆ یەکێتی |
| 35% | بۆ پێشمەرگە |
| 35% | بۆ حکومەت |

یارمەتی حیزبەکان (حکومەت ئەیدا):

| | |
|---|---|
| 4.088.000 | چوار ملیۆن و هەشتاو هەشت هەزار بەمجۆرە: |
| 2.000.000 | بزوتنەوەی ئیسلامی |
| 700.000 | سۆسیالیست |
| 600.000 | زەحمەتکێشان |
| 250.000 | پارێزگاران |
| 100.000 | دیمۆکراتیخوازان |
| 128.000 | هاوپەیمانی |
| 200.000 | حشع |
| 60.000 | الحزب الوطنی العراقی |
| 50.000 | کۆمۆنیستی کرێکاری |

36.000.000 (سیوشەش ملیۆن) موچەی فەرمانبەران

یارمەتی شەهیدان

| | |
|---|---|
| 2.250.000 | شەهیدانی شەڕی ناوخۆ (فەرماندەیی ئەیدا) |
| 2.000.000 | دەزگای شەهیدان ئەیدا |

حکومەت ئەیدا 543.000

*

7ی 7ی 99:

بە پێی نامەی عەلی محەمەد عەبدوڵا بەڕێوەبەری بانکی سەلام داهاتی هەمو گومرگەکانی ئەمڕۆ بەم جۆرە بوە:

دینار 1.748.260

دۆلار 15.320

*

## 3. دەزگاکانی ڕاگەیاندنی یەکێتی

25ی 8ی 99، چوار شەمە:

مەکتەبی ڕاگەیاندنی یەکێتی بوە بە دەزگایەکی گرنگی ڕاگەیاندن لە هەر سێ بواری بیستن و بینین و خوێندنەوە دا. ژمارەیەکی زۆر ڕۆژنامەوان کاری تیدا ئەکەن. مام جەلال خۆی ڕۆژانە ڕێنمایی و چاودێری هەواڵەکانی و وتارەکانیان ئەکا. ئافەرینی هەندێ ئەکا و لە هەندێکیان تورە ئەبێ. ڕۆژانە خۆی هەواڵەکانی خۆی ئەنێرێ بۆیان و خۆی وێنەی خۆی بۆ بڵاوکردنەوە هەڵئەبژێرێ.

حەزم ئەکرد بەشداریەك بکەم لە بواری گەشەپێدانی ڕۆژنامەوانیدا و هەندێ لەو بیروبۆچونانەی خۆم باوەڕم پێیان بو لە بواری ڕاگەیاندنی ئازادا بۆ ڕۆژنامەوانەکانی دەزگای ڕاگەیاندنی ڕون بکەمەوە، بەڵام ڕاگەیاندن بەشێك بو لە سیستەمی تۆتالیتاری حیزب و حکومەت. ئەو چوارچێوەیەش تەسك و داخراو بو.

لە گەڵ دەزگای ڕاگەیاندن ڕێک کەوتم هەمو چوارشەمەیەک، پاش نیوەڕۆیان، لە گەڵ ژمارەیەک لە کادرەکانیانکۆڕێک بگرین بۆ باسی بابەتێکی سیاسی یا ڕۆژنامەوانی. لەو ماوەیەدا هەوڵم دا دۆخی ڕۆژنامەوانی لە کوردستانی عیراقدا، بە تایبەتی لە ناوچەی دەسەڵاتی یەکیتیدا، هەڵ بسەنگێنم. ئەگەر بتوانم بەرەو هەندێ کرانەوە و ڕۆشنایی بەرم.

زۆری چوارشەموانی مایس و نیسان و حوزەیران و ئاب بەردەوام بوم.

*

ڕاگەیاندن لە کوردستان بە هەر سێ جۆری باوی: خوێندنەوە: ڕۆژنامە و گۆڤار.. بیستن: ڕادیۆ، بینین: تەلەڤزیۆن و ڤیدیۆ.. گرنگیەکی زۆری پەیدا کردوە. هەردو ئیدارە: هەولێر و سلێمانی بایەخێکی زۆریان بە ڕاگەیاندن داوە حیزبەکانی کوردستان بە گشتی و هەردو حیزبی دەسەڵاتدار بودجەی گەورەیان بۆ تەرخان کردوە و ژمارەیەکی زۆر

رۆژنامەوانیان تێدا دامەزراندوە.

رۆژنامە، هەفتەنامە، مانگنامە، وەرزنامەی جۆراوجۆر دەرئەچێ.

پەخشی رادیۆی شەپۆلی کورت، ناونجی، ئێف ئێم، ئەی ئێم بڵاو ئەکرێتەوە.

تەلەفزیۆنی ناوچەیی و کەناڵی ئاسمانی بەرنامەکانیان بە جیهان ئەگەیەنن.

بایەخدانی حیزبەکان بە راگەیاندن زیاتر لەوەی بۆ رۆشن کردنەوەی رای گشتی و بەرز کردنەوەی ئاستی زانیاری خەڵك و گەیاندنی راستی و روداو بێ بە وەرگر، لە رێگەی بیستن، بینین، خوێندنەوە، پرۆپاگاندەیە بۆ حیزب و سەرکردەکەی.

راگەیاندن یەکێکە لە کۆڵەکە سەرەکیەکانی سیستەمی حوکمڕانی تۆتالیتاری، بۆ دەس گرتن بە سەر هۆش و بیری کۆمەڵانی خەڵكدا. هەردو حیزبی ناکۆك، بۆ ئەنجامدانی ئەم مەبەستە، هەر یەکەیان بە جۆرێ لە بەرامبەر ئەوی تردا، دەزگای راگەیاندنی خۆی گەورە کردوە.

*

لە سنوری دەسەڵاتی یەکێتیدا – ئیدارەی سلێمانی، چەند جۆرێ راگەیاندن هەیە:

راگەیاندنی حیزبی

ئەم حیزبانە دەزگای راگەیاندنی تایبەت بە خۆیان هەیە، لە تەلەڤزیۆن و رادیۆ و رۆژنامە:

یەکێتیی نیشتمانی رۆژنامەی "کوردستانی نوێ" و هەفتەنامەی "الاتحاد".

حیزبی زەحمەتکێشان "ئاڵای ئازادی"

حیزبی سۆسیالیستی دیمۆکراتی "رێبازی ئازادی"

حیزبی شیوعی هەفتەنامەی "رێگای ئازادی".

پارتی پارێزگاران

بزوتنەوەی ئیسلامی هەفتەنامەی "بزوتنەوە".

یەکگرتوی ئیسلامی هەفتەنامەی "یەکگرتو".

ئەم رۆژنامانە لە روی داراییەوە سەربەخۆ نین. لە لایەن حیزبەکانیانەوە ئەژێنرێن و حیزبەکانیشیان لە لایەن حکومەتی هەرێمەوە ئەژێنرێن. بە کەمی لە ناو خەڵك دا ئەخوێنرێنەوە، بە زۆری لە بارەگا و بنکەکانی خۆیاندا بڵاو ئەکرێنەوە. جاروبار رەخنە ئەنوسن بەڵام هیچ کامیان بە دەنگی موعارەزە ناژمێردرێن.

رۆژنامەکانی پارتی: خەبات، برایەتی و گوڵان، کە لە هەولێر دەرئەچن و، رۆژنامەکانی بەعس: سەورە، جمهوریە، عیراق، بابل، کە لە بەغداد دەرئەچن لە سلێمانی بە ئازادی ئەفرۆشرێن، بەڵام هیچ کامیان لە سلێمانی نوسینگە و پەیامنێریان نیە.

راگەیاندنی حکومەتی - وەزارەتی

هەمو وەزارەتەکان بەشی راگەیاندنیان هەیە چالاکی وەزیرەکانیان بە نوسین و رەنگ و دەنگەوە ئەنێرن بۆ دەزگاکانی راگەیاندن. رێگە نادەن رۆژنامەوانی دەرەوەی وەزارەتەکەیان لە کاروباری وەزارەتەکەیان بکۆڵێتەوە و زانیاری و ئاگادارییان پێ نادەن.

وەزارەتی رۆشنبیری هەفتەنامەی "هەرێم" دەرئەکات و رادیۆیەکیشی هەیە بەڵام رۆژنامەوانی حکومەتی، بەو مەعنایەی کە سیاسەتی رەسمیی حکومەت و هەڵوێستەکانی لە روداوەکان دەربڕێ، نیە. ئەو کارە حیزب ئەنجامی ئەدا نەك حکومەت.

هەندێ لە وەزارەتەکان گۆڤاری تایبەت بە خۆیان دەرئەکەن کە تەرخان کراوە بۆ بواری کاری وەزارەتەکە:

وەزارەتی رۆشنبیری، وەرزنامەی "هەزارمێرد" دەر ئەکا کە تەرخان کراوە بۆ شوێنەوارناسی.

وەزارەتی کشتوکاڵ، وەرزنامەی "بژوێن" دەر ئەکا کە تەرخان کراوە بۆ کشتوکاڵ.

وەزارەتی ناوخۆ، گۆڤاری "ناوخۆ" دەر ئەکا کە تەرخان کراوە بۆ کاروباری قانونی.

*

راگەیاندنی ئەهلی

هەندێ هەفتەنامە و مانگنامە چ وەك رۆژنامە و چ بە شێوەی گۆڤار دەرئەچێ. هەندێکیان یارمەتی پچڕ پچڕ لەم کاربەدەست و لەو دەزگا وەرئەگرن، زۆر لەمانە بەردەوام نین چەند ژمارەی لێ دەرئەچێ و رائەوەستێ، زۆری ئەوانەی دەری ئەکەن پیشەیی نین بەڵکو "هاوی"ن خۆیان دوای ژمارەیەک یا چەند ژمارەیەک رای ئەگرن.

*

راگەیاندنی یەکێتی

لە بواری رۆژنامەوانی نوسراودا، یەکێتی بە زمانی کوردی رۆژنامەی رۆژانەی کوردستانی نوێ و بە زمانی عەرەبی هەفتەنامەی الاتحاد دەر ئەکا. ئیمتیازی یەکەمیان بە ناوی د کەمال فوئاد و دوەمیان بە ناوی د فوئاد مەعسومە. هەردوکیان ئەندامی مەکتەبی سیاسی یەکێتین. تەنیا ئیمتیازەکانیان بە ناوەوەیە ئەگینا کەسیان پێوەندییان بەم دو رۆژنامەیە و بە دنیای رۆژنامەوانیەوە نیە.

جگە لەمان ئیستا بۆتە باو زۆری بەرپرسە پایەبڵندەکان گۆڤارێ یان رۆژنامەیەکیان بە ناوەوە هەبێ، بۆ نمونە:

عادل موراد، سەرنوسەری "الاتحاد"

ئەرسەلان بایز، ئیمتیازی گۆڤاری "رێبازی نوێ"

عومەر فەتاح، ئیمتیازی گۆڤاری "سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجی"

عیماد ئەحمەد، سەرنوسەری گۆڤاری "بیر و هۆشیاری"

فەرەیدون عەبدولقادر، ئیمتیازی وەرزنامەی "پەیڤین"
شێخ محەمەدی شاکەلی، ئیمتیازی گۆڤاری "کەرکوك"
جەلال جەوهەر، سەرنوسەری گۆڤاری "کەرکوك"
ئازاد جندیانی، سەرنوسەری گۆڤاری "مەدەنیەت"

لە بواری رۆژنامەوانی بیستراودا، یەکێتی رادیۆیەکی ناوەندی بە زمانی کوردی (بە هەردو زاراوی کرمانجی و سۆرانی) و بە زمانی عەرەبی هەیە، بەرنامەکانی بە ناوی "دەنگی گەلی کوردستان" ەوە بلاو ئەکاتەوە، هەروەها چەند رادیۆیەکی ناوچەیی.

بارزان شێخ عوسمان بەڕێوەبەری رادیۆی ناوەندیە.

*

لە بواری رۆژنامەوانی بینراودا، یەکێتی تەلەڤزیۆنێکی ناوەندی و چەند تەلەڤزیۆنێکی ناوچەیی هەیە. پەخشی تەلەڤزیۆنەکەی سەرانسەری کوردستان ناگرێتەوە.

شوان کەریم کابان، بەڕێوەبەری تەلەڤزیۆنی ناوەندیە.

لە دنیای دیمۆکراتیدا راگەیاندن لە دروستکردنی رای گشتیدا دەورێکی کاریگەری هەیە، لە بلاوکردنەوەی رۆشنایی و ریسوا کردنی گەندەلی و ئاشکراکردنی کەموکوڕیدا دەسەلاتی چوارەمە. لە هەلبژاردندا ئەتوانێ دەسەلاتی حیزبێ بگۆڕێ بە حیزبێکی کە، ئەتوانێ حکومەت بڕوخێنێ، حکومەتی تازە بهێنێتە سەر کار، ناچاری بکا ریفۆرم بکا.

راگەیاندنی کوردستان، وەکو هەمو دیاردە دیمۆکراتیەکانی کوردستان، تایبەتمەندی خۆی هەیە. ئەم راگەیاندنە ناتوانێ رای گشتی سەربەخۆ دروست بکا چونکە خۆی کۆلەکەیەکی سیستەمی تۆتالیتاری حکومەتی هەرێمی کوردستانە. دامەزرێنراوە پرۆپاگاندە بۆ حیزب و سەرۆکەکەی و کاربەدەستەکانی بکا.

*

هەوالّ کە شادەماری رۆژنامەوانیە لە دەزگای راگەیاندنی کوردیدا بە گشتی و لە هی یەکێتیدا بە تایبەتی، لە قالب دراوە.

هەوالەکان: لە لایەن راگەیاندنی تایبەتی بەرپرسەکانەوە هەلّ ئەبژێردرێن و دائەڕێژرێن و ئەنێردرێن بۆ بلاو کردنەوە، ئەوەندەی من ئاگادارم، بۆ نمونە:

هیچ جارێ نیە بابەتی گفتوگۆی ناو م س و بابەتەکانی گفتوگۆی ناو کۆبونەوەی هاوبەشی یەکیتی و پارتی بە راستی بنێردرێ بۆ دەزگای راگەیاندن و بلاو بکرێتەوە.

هیچ جارێ نیە بڕیارە گرنگەکانی سەرۆکایەتی ئەنجومەنی وەزیران و وەزیرەکان دەربارەی قۆنتەرات، بەخشینی زەوی و زار، خانو، بگاتە دەزگاکانی راگەیاندن.

هەواڵەکانی دەزگای راگەیاندنی کوردی وەرگر نابزوێنێ و رای ناکێشێ بۆ خوێندنەوە و بە دوادا چون.

*

رۆژنامەوانیی کوردی لاسایی کردنەوەی رۆژنامەوانیی بەعسە، رۆژنامەوانیی بەعسیش لاساییکردنەوەی رۆژنامەوانیی وڵاتانی ئەوروپای رۆژهەڵاتە. فەرهەنگی بەعس لە راگەیاندنی کوردیدا، لەم لایەنانەدا، بە زەقی رەنگی داوەتە:

- دێواندنی سەرکردە (مەبەست کردنی سەرکردەیە بە دێوی ئەفسانەکانی سەردەمی کۆن)

بڵاوکردنەوەی رۆژانەی وێنەی سەرکردە لە لاپەڕەی یەکەمی هەمو ژمارەکانیدا و بڵاوکردنەوەی دەقی وتارەکانی بە بێ لێ قرتاندن و بە بێ کورت کردنەوە و، چەپڵەڕێزانی زۆر لە هاتن و رۆیشتن و لە میانەی قسەکانیدا.

بڵاوکردنەوەی وتاری جۆراوجۆری نوسەرانی لە پەراوێزی وتارەکانی سەرکردەدا بۆ ستایش و پیاهەڵدان و لێکدانەوە و شیکردنەوەی.

زل کردنی دەوری ئەفسانەیی سەرکردە لە هەمو روداوە چارەنوسسازەکانی کوردستاندا.

- تاریکاندنی کاروباری حیزب و حکومەت (مەبەست شاردنەوەی کێشە ژیانیەکانی خەڵکە لە خەڵك)

هێشتنەوەی بودجەی حکومەت و حیزب و دەزگاکانی لەوانە دەزگای راگەیاندن بە نەزانراوی لە تاریکیدا.

هێشتنەوەی تەندەر و قۆنتەرات و پرۆژەکانی حکومەت لە تاریکیدا.

رێگرتن لە بڵاوکردنەوەی رەخنە لە حکومەت و حیزب و رەفتاری کاربەدەستەکانی و پرۆژەکانی.

هێشتنەوەی گفتوگۆکانی ناو م س و نێوان یەکێتی و پارتی لە تاریکیدا.

- گەوجاندنی خەڵك (مەبەست خەواندنی هۆش و شێواندنی بیری خەڵکە)

تێکەڵاو کردنی رەش و سپی، پاك و پیس، چاك و خراپ، راست و چەوت، سەرکەوتن و ژێرکەوتن و، بەهانە هێنانەوە بۆ گەندەڵی و بێدادی.

*

بۆیە خوێندەواری کورد بایەخ بە رۆژنامە نادا، چونکە رۆژنامە هیچ گرنگیەکی نیە لە ژیانی کۆمەڵایەتی، سیاسی، رۆشنبیری، تەنانەت لە بواری رابواردن و کات بە سەر بردنی کەسی ئاساییدا.

## 4. گەشتە سیاسی و دیپلۆماسیەکانی مام جەلال

لە گەڵ پێکهێنانی یەکەمین کابینەی حکومەتی هەرێمی کوردستاندا وەزارەتێك دروست کرا بە ناوی "وەزارەتی هاوکاری و یارمەتی مرۆڤایەتی". محەمەد تۆفیق رەحیم (لە یەکێتی) بە وەزیر و کەمال کەرکوکی (لە پارتی) بە جێگری دانران. هەرچەندە ئەم وەزارەتە ناوەکەی سەیر بو، پێکهاتەکەیشی لە سەر بنچینەی نیوەبەنیوەی حیزبیی شتێکی سەیرتر بو، بەڵام ئامانج لە دروستکردنی ئەوە بو، وەکو هەمو دەوڵەتانی سەربەخۆ، کاروباری وەزارەتی دەرەوە ئەنجام بدا و، نوێنەرایەتی حکومەتی هەرێم لەو وڵاتانەدا کە پێویستن دابمەزرێنێ و، پێوەندی لە نێوان حکومەتی هەرێم و رێکخراوە بیانیەکان رێك بخا.

ئەو کاتە هەمو وەزارەتەکان و پۆستە گرنگەکان لە نێوان پارتی و یەکێتیدا دابەش ئەکران. لە بەر ئەوە نوێنەرایەتیەکانیش دابەش کران. وا رێك کەوتن نوێنەرایەتی ئەمەریکا و بەریتانیا و ئەڵمانیا و فەرەنسا دابەش بکەن.

لە ئەمەریکا یەکێتی د بەرهەم ساڵح و، لە بەریتانیا پارتی دڵشاد میران و، لە فەرەنسا یەکێتی د محەمەد سابیر و، لە ئەڵمانیا پارتی دڵشاد بارزانی بە نوێنەری حکومەتی هەرێمی کوردستان دانا.

پێشتر هەردو حیزب نوێنەرایەتی خۆیان لە هەندێ وڵات دامەزراند بو. دوای ئەم دابەشکردنەش لە پاڵ نوێنەرایەتی حکومەتی هەرێمدا هەر یەکەیان نوێنەرایەتی تایبەت بە حیزبی خۆیان دانا. ئەمەش لە باتی ئەوەی نوێنەرایەتیەکان یەك بخات دونیمەی کردن.

نوێنەرایەتیەکان بە ناو نوێنەرایەتی حکومەتی هەرێم بون، چونکە لە باتی حکومەتی هەرێم حیزبەکانی خۆیانیان بە "مەرجەع" ئەزانی و لە گەڵ ئەوان پێوەندییان ئەکرد و رێنماییان لەوان وەرئەگرت.

دوای هەڵگیرسانی شەڕی ناوخۆ نوێنەرایەتیەکانی حکومەت، کە پێشتریش پێکەوە نەنوسا بون، ئیتر بە تەواوی لە یەك ترازان، هەر یەکەیان بوەوە بە نوێنەری حیزبەکەی خۆی و حکومەتەکەی خۆی.

وەزارەتی هاوکاری ئیشەکانی هات بوە سەر رێکخستنی پێوەندی لە گەڵ رێکخراوە بیانیە ناحکومەتیەکان و، دوای بڕیاری نەوت بە خۆراکی ئەنجومەنی ئاسایش پێوەندی لە گەل رێکخراوەکانی نەتەوە یەکگرتوەکان.

نوێنەرانی یەکێتی لە دەرەوە راستەوخۆ پێوەندییان لە گەڵ مام جەلال هەبو و، رێنماییان لەو وەرئەگرت نەك لە مەکتەبی پێوەندیەکان. مەکتەبی پێوەندییەکان، وەکو مەکتەبەکانی تر، راستەوخۆ بەسترا بون بە مام جەلالەوە. خۆیان بەرنامەیەکی تایبەتییان نەبو بۆ رێکخستن و گەشەپێدانی کارەکانیان، بۆ رێکخستنی پێوەندی یەکێتی و حیزب و

دەوڵەتانی دنیا، بۆ پێگەیاندنی کادری دیپلۆماسی. ئامۆژگاری و ڕێنمایی و فەرمانیان لە مام جەلال وەرئەگرت. سیستەمی کار لەم مەکتەبەدا بە جۆرێ بو نەیئەتوانی ببێتە دامەزراوێکی کارا و کارامە.

ئیشی سەرەکی مەکتەبی پەیوەندیەکان بریتی بو لە:

- پێوەندی لە گەڵ ڕێکخراوە بیانیە ناحکومەتیەکان و، واسیتە کردن بۆ دامەزراندنی کارمەند و فەرمانبەر (بە پاسەوان، شۆفێر، وەرگێڕ، ئەندازیار، بەڕێوەبەر...) لە بەر ئەوەی موچەکانیان باشتر بو لە موچەی کارمەندانی حکومەتی هەرێم.

- دروستکردنی (برگ تردد) بۆ هاتوچۆی ئێران.

مەکتەبی پێوەندیەکان ئەیتوانی ببێتە دەزگایەك بۆ ڕاهێنان و پەروەردە کردن و پێگەیاندنی کادری باش لە بواری دیپلۆماسیدا. ئەیتوانی ژمارەیەکی باش لە کەسانی لێوەشاوە و زمانزان هەڵببژێرێ لە کوردستان و لە ئەوروپا کۆرسی جۆراوجۆری کورت و چڕیان بۆ بکاتەوە بۆ شارەزا کردنیان لە بوارەکانی دیپلۆماسی، پێوەندی ناودەڵەتی، دانوسەندن، گێڕانی ململانێ، پێکەوەنانی لۆبی...

ئەو کاتەی لە لەندەن بوم جارێکیان بە ڕەزامەندی مام جەلال لەم بارەیەوە، لە گەڵ هەندێ لە گەورە بەرپرسانی دامەزراوی لێکۆڵینەوەی ستراتیجی (IISS) قسەم کرد کە ئاخۆ ئەتوانن خولێکی لەو بابەتەمان بۆ ڕێك بخەن. بە خۆشیەوە ئامادەیی خۆیان دەربڕی بۆ ئامادە کردنی جێگەی دەرسەکان و شوێنی مانەوەی بەشدارەکان و دۆزینەوەی مامۆستاکانیان. هەر بۆ ئەو مەبەستە لە گەڵ د لەتیف ڕەشید کە ئەودەم نوێنەری یەکێتی بو لە بەریتانیا چوینە "وایت هۆڵ" قسەمان لە گەڵ کردن کە ئەوانیش بۆ ڕاهێنانیان یارمەتیمان بدەن. هەرچەندە گفتی هاوکارییان پێ داین، یەکێ لەوانەی قسەمان لە گەڵ کرد ژنێ بو، بە تەوسەوە لێی پرسین: "چیە ئەتانەوێ دەوڵەت دروست بکەن؟" وتمان: "ئەگەر دەوڵەتیش دروست نەکەین، لە پاشەڕۆژدا کە بوین بە شەریک لە حکومەتی عیراقدا پێویستیمان بە کادری دیپلۆماسی ئەبێ، چونکە لە ئیستادا کاری دیپلۆماسی پاوانە بۆ بەعس."

بەڵام ئەم خولە هەرگیز ڕێک نەخرا.

17 ی 4 ی 99:

ئەمڕۆ مام جەلال سەفەری کرد بۆ ئێران.

دارۆی شێخ نوری، مەلا بەختیار، فاروقی مەلا مستەفای لە گەڵ خۆی بردون. گۆیا بۆ کاروباری بازرگانی چون.

مام جەلال سەفەر زۆر ئەکا. ئەمە یەکەم سەفەری نیە و دوا سەفەری نابێ. درۆی تێدا نیە ئەگەر بڵێم سەفەر بەشێکی گرنگی ژیانی مام جەلال پێك ئەهێنێ. ئەمەش خوی ئیستای نیە بەڵکو لە هەمو ژیانیدا وەها بوە.

لە سەردەمی شاخ دا، ئەو ماوەیەی لێ دەربچێ، بە هۆی

گەمارۆدانی شۆڕشەوە لە لایەن ئێران و تورکیاوە، ڕێگەی لێ بەسترا بو نەیئەتوانی سەفەر بکا هەرچەند هەلێکی بۆ هەڵکەوتبێ سەفەری کردوە.

مانگی 11 ی ساڵی 1987، بەر لە عەمەلیاتی ئەنفال، لە چەند سەرچاوەی جیاوازەوە هەواڵمان بۆ ئەهات کە جەیشی عیراق لە خۆئامادەکردن و نەخشەدانان دایە بۆ گەورەترین لەشکرکێشی بۆ سەر کوردستان، ئەو بە بیانوی ئەوەی ئێران دەعوەتی کردوە سەفەری کرد بۆ تاران، لەوێوە بۆ دیمەشق، ئینجا بۆ ئەوروپا تاسەرەتای ساڵی 1989 مایەوە. سەردانێکی کورتی ئێرانی کرد. بە سەریدا ئیمام خومەینی مرد. لە ناو ئێراندا هەندێ کۆبونەوەی بە ئەندامانی سەرکردایەتی و کادرەکان کرد و دوای ئەوەی لە مەراسیمی ناشتنی خومەینیدا بەشدار بو گەڕایەوە ئەوروپا تا دوای سەرکەوتنی راپەڕین لە ئازاری 1991 دا، هەر لە دەرەوە مایەوە.

دوای راپەڕین ڕێگەی ئێران و تورکیای بۆ کرایەوە ئیتر لە سەفەری بەردەوامدا بو.

هەرچەندە مام جەلال هەمیشە رەنگی سیاسی ئەدا بە سەفەرەکانی بەڵام لە راستیدا ئامانجی سەرەکی زۆر لە سەفەرەکانی خۆ دورخستنەوەیە لە روداوەکانی کوردستان و خۆناساندنە بە گەورەپیاوانی دنیا و، گرتنی وێنەی یادگاریە لە گەڵیان.

*

لە دوای گەڕانەوەم بۆ کوردستان سەفەرەکانی مام جەلالم بۆ دەرەوەی وڵات لە دەفتەرەکەمدا تۆمار کردوە. بۆ هەڵسەنگاندن و بەراورد تەنیا ماوەی 10 مانگی ساڵەکە لە کۆتایی مانگی 2 تا کۆتایی مانگی 12 ی 1999 وەر ئەگرم چونکە ئەو دو مانگەی من لە کوردستان نەبوم. بەڵام لێرەدا لە باتی نوسینی رۆژانەی خۆم کە تۆمارم کردون، هەواڵی گەشتە سیاسی و دیپلۆماسیەکانی مام جەلال، وەکو ناویان لێ ناوە، دەقاودەق لە رۆژنامەی کوردستانی نوێ، واتە رۆژنامەی رەسمیی یەکێتی یا راستتر لە رۆژنامەی رەسمیی خودی مام جەلالەوە رائەگوێزم.

1. گەشتی 17 / 4 – 3 / 5 / 1999.

"مام جەلال بە سەردانێکی رەسمی روی کردە ئێران

"پێش نیوەڕۆی دوێنێ 17 ی 4 هەڤاڵ مام جەلال بە سەردانێکی رەسمی بەرەو کۆماری ئیسلامی ئێران بە رێ کەوت.

"هەڤاڵ مام جەلال و وەفدە هاوڕێکەی کە پێك هات بون لە هەڤاڵان دارۆ شێخ نوری ئەندامی ئیحتیاتی مەکتەبی سیاسی و مەلا بەختیار ئەندامی سەرکردایەتی، لە سەر سنور بە گەرمی لە لایەن بەڕێزان جەلال جەوهەر پارێزگاری کەرکوك و ژمارەیەکی زۆر لە لێپرسراوانی دەزگا حکومی و حیزبیەکانەوە بە رێ کرا." کوردستانی نوێ: ژ 1840 رۆژی 18 ی 4 ی 1999.

"دوای سەردانێکی رەسمی بۆ ئێران مام جەلال گەڕایەوە بۆ خاکی هەرێم

"دوای سەردانێکی رەسمی بۆ تاران کە لە سەر بانگێشتی رەسمی کۆماری ئیسلامی ئێران بو، سەعات 3،45 ی پاش نیوەڕۆی دوێنێ 3 ی 5 هەڤاڵ مام جەلال لە سنورەوە گەیشتەوە خاکی هەرێمی کوردستانی عیراق.

"لە گەڕانەوەدا هەڤاڵان د بەرهەم ساڵح ئەندامی ئیحتیاتی مەکتەبی سیاسی و نوێنەری حکومەتی هەرێم لە واشنتۆن و بەهرۆز گەلاڵی نوێنەری یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان لە تاران هاوڕێی مام جەلال بون. لە سەر سنوریش لە لایەن هەڤاڵ نەوشیروان مستەفا و بەڕێز کۆسرەت رەسول عەلی سەرۆکی حکومەتی هەرێم و هەڤاڵ جەبار فەرمان جێگری فەرماندەی گشتی و هەڤاڵانی مەکتەبی سیاسی و سەرکردایەتی و وەزیرە بەڕێزەکان و پارێزگارانی سلێمانی و کەرکوك و لێپرسراوانی دەزگا حیزبی و حکومیەکان و فەرماندەییەکانی هێزی پێشمەرگە و جەماوەرێکی زۆرەوە پێشوازیەکی گەرمی لێ کرا.

"پاشان لە رێگای عەربەت لە لایەن نوێنەرانی حیزبەکانی هاوپەیمانیی دیمۆکراتی کوردستان بەڕێزان قادر عەزیز سکرتێری حیزبی زەحمەتکێشانی کوردستان، محەمەدی حاجی مەحمود سکرتێری حیزبی سۆسیالیستی دیمۆکراتی کوردستان و بەهادین نوری سکرتێری بزوتنەوەی دیمۆکراسی خوازان و نوێنەرانی پارتی پارێزگارانی کوردستان و لایەنە سیاسیەکانی کوردستان و عیراقەوە بەخێرهاتنەوە و پێشوازی گەرمی لێ کرا.

"لە دەروازەی شاری سلێمانی‌یشدا نوێنەرانی دەزگا حیزبی و حکومیەکان و رێکخراوە پیشەییەکان و نوێنەرانی ژنان و جەماوەرێکی زۆری شاری سلێمانی لە پێشوازی هەڤاڵ مام جەلال دا بون.

"دواتر بەڕێزی بەرەو بارەگای خۆی لە شاری سلێمانی بە رێ کەوت." کوردستانی نوێ: ژ 1852 رۆژی 4 ی 5 ی 1999.

2. گەشتی 25 / 8 - 5 / 9 / 1999.

"دوای سەردانێکی بۆ تاران مام جەلال گەیشتەوە خاکی هەرێم

"دوای زیارەتێکی کورت بۆ پایتەختی کۆماری ئیسلامی ئێران، ئێوارەی دوێنێ 5 ی 9 لە سنوری پەروێزخانەوە هەڤاڵ مام جەلال هاوڕێ لە گەڵ هەڤاڵان د فوئاد مەعسوم و عومەری سەید عەلی ئەندامانی مەکتەبی سیاسی و د لەتیف رەشید نوێنەری یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان لە بەریتانیا و بەکر فەتاح نوێنەری یەکێتی لە ئیتالیا گەیشتەوە خاکی هەرێم.

"شایانی باسە بەڕێز سەرۆکی حکومەت و هەڤاڵان ئەندامانی مەکتەبی سیاسی و ژمارەیەك لە وەزیرە بەڕێزەکان و نوێنەرانی

حیزبەکانی هاوپەیمانی دیمۆکراتی لە رێورەسمی پێشوازی کردندا ئامادە بون، پاشان بەرەو شاری سلێمانی بە رێ کەوتن و سەعات 8 ی ئێوارەی دوێنێ گەیشتەوە بارەگای تایبەتی خۆی." کوردستانی نوێ: ژ 1941 رۆژی 6 ی 9 ی 1999.

3. گەشتی 17 / 9 – 13 / 10 / 1999.

"مام جەلال بەرەو واشنتۆن بە رێ کەوت

"سەعات 10،30 ی سەرلەبەیانی دوێنێ 17 ی 9 هەڤاڵ مام جەلال خاکی کوردستانی عیراقی بە جێ هێشت و بەرەو تاران بە رێ کەوت، بڕیاریش وایە لەوێوە بەرەو واشنتۆن بە رێ بکەوێ تا لەو کۆبونەوە باڵایەدا بەشدار بێ کە ئۆپۆزیسیۆنی عیراق، بە بانگێشت و چاودێری ئەمریکا لە پایتەختی ئەمریکادا ئەنجامی دەدا.

"شایانی وتنە لەم گەشتەی هەڤاڵ مام جەلال، بەڕێز مەلا عەلی عەبدولعەزیز رابەری گشتی بزوتنەوەی یەکبونی ئیسلامی هاوڕێیەتی دەکا و هاوکات هەڤاڵ دکتۆر فوئاد مەعسوم ئەندامی مەکتەبی سیاسی لە گەڵ وەفدەکە سەفەری تاران دەکات.

"پێویستی وەبیر هێنانەوەیە کە بڕیار وایە لە کۆبونەوەی ئاماژە پێدراوی ئۆپۆزیسیۆنی عیراق، نوێنەرانی INC و تەییاری ناوەند بەشداری تێدا بکەن." کوردستانی نوێ: ژ 1951 رۆژی 18 ی 9 ی 1999.

"دوای سەرۆکایەتی وەفدی ئۆپۆزسیۆن لە کۆبونەوەکانی ئەمریکادا مام جەلال گەڕایەوە هەرێمی کوردستان

"سەعات 10 ی سەرلەبەیانی دوێنێ 13 ی 10 هەڤاڵ مام جەلال گەیشتەوە هەرێمی کوردستان و لە سنوری پەروێزخانەوە لە لایەن هەڤاڵانی م س و سەرۆکی حکومەت و هەڤاڵانی سەرکردایەتی و فەرماندەیی گشتی و وەزیرەکانی حکومەتی هەرێم و ژمارەیەکی زۆر لە بەرپرسەکانی یەکێتی و حکومەت و پێشمەرگایەتی و ژمارەیەك لە نوێنەرانی لایەنە سیاسیەکانەوە بە گەرمی پێشوازی لێ کرا.

"لەم گەشتی گەڕانەوەیەدا هەڤاڵان بەهرۆز گەڵاڵی لێپرسراوی مەکتەبی تاران، شازاد سائیب لێپرسراوی مەکتەبی ئەنقەرە، سەلاح رەشید نوێنەری یەکێتی لە ئەڵمانیا و بەڕێز شەمسەدین موفتی هاوڕێیەتی‌یان دەکرد.

"شایانی باسە، لە کۆتاییەکانی مانگی رابردودا هەڤاڵ مام جەلال بە سەرۆکایەتی وەفدێکی پایەبڵندی ئۆپۆزسیۆنی عیراق و هاوکات لە گەڵ کۆبونەوەکانی کۆمەڵەی گشتی نەتەوە یەکگرتوەکان سەردانی نیویۆرکی کرد و لەوێ وێڕای کۆبونەوەی لە گەڵ لێپرسراوانی حکومەتی ئەمریکا لە گەل نوێنەرانی UN و باڵیۆزان و نوێنەرانی ژمارەیەك لە وڵاتانی ئەندامی ئەنجومەنی ئاسایش کۆبوەوە و دواتریش لە گەشتێکی‌دا بۆ واشنتۆن لە گەل بەرپرسەکانی ئەمریکا و بە تایبەت ئەوانەی بە

مەسەلەکانی کورد و عیراقەوە پەیوەنددارن کۆبۆوە.

"سەرچاوەیەکی نزیك لە هەڤاڵ مام جەلال لە وەڵامی پرسیارێکی تەلەفزیۆنی گەلی کوردستاندا ئەم گەشتەی هەڤاڵ مام جەلالی بە یەکێك لە گەشتە دیپلۆماسیە سەرکەوتوەکان ناساند و رونی کردەوە کە لە ئایندەی زۆر نزیکدا کاریگەری سەرکەوتنەکانی ئەو گەشتە بە سەر مەسەلە جیاجیاکانی کوردستان و عیراقەوە دیار دەبێ، هەم سەبارەت بە مەسەلەی ئاشتبونەوە و هەم سەبارەت بە کاراتر بونی ئۆپۆزسیۆن و هەم سەبارەت بە بڕیاری 986 ی ئەنجومەنی ئاسایش.

"هەروا سەرچاوەکە ئاماژەی بەوەش دا کە هەڤاڵ مام جەلال لەو گەشتەیدا بە شێوەیەکی بەرفراوان و قوڵ قورسایی خۆی خستبوە سەر کارا کردنی بڕیاری 688 ی ئەنجومەنی ئاسایش و لەو چوارچێوەیەشدا مەسەلەی تەعریب کردنی کوردستانی وەك یەکێك لە سیاسەتە دزێو و شۆڤێنیەکانی حکومەتی بەغدا گرنگی زۆری پێ درا." کوردستانی نوێ: ژ 1974 رۆژی 14 ی 10 ی 1999.

4. گەشتی 26 / 10 – 9 / 12 / 1999.

**"بە مەبەستی بەشدار بون لە کۆنگرەی ئۆپۆزسیۆنی عیراق مام جەلال بەرەو ئەمریکا بە رێ کەوت**

"پاش نیوەڕۆی دوێنێ 26 ی 10 هەڤاڵ مام جەلال لە سنوری پەروێزخانەوە خاکی هەرێمی کوردستانی بە جێ هێشت و بەرەو تاران بە رێ کەوت، بڕیاریشە لەوێوە بەرەو ئەمریکا بە رێ بکەوێ تا لە کۆنگرەی ئۆپۆزسیۆنی عیراقدا بەشداری بکا کەوا چاوەڕوان دەکرێ 29 ی ئەم مانگە لە نیویۆرك ببەسترێ.

"سەرچاوەیەکی ئاگادار لە یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان بە رۆژنامەکەمانی راگەیاند کە دوای ئەوەی مەکتەبی سیاسی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان زنجیرەیەك کۆبونەوەی بە مەبەستی تاووتوێ کردنی چۆنیەتی و ئاستی وەفدی یەکێتی لەو کۆنگرەیە ئەنجام دا و هەڵوێستەکانی یەکێتی بەرامبەر سەرجەم ئەو مەسەلانە ساغ کردەوە کە رەنگە لە کۆنگرەکەدا باس بکرێن و بڕیاریان لە سەر بدرێ، بە تایبەت ئەو مەسەلانەی کە پەیوەندییان بە داخوازیەکانی گەلی کوردەوە هەیە لە عیراقی داهاتودا و هەروا لە بەر گرنگی کۆنگرەکە لەم قۆناغەدا و بە لە بەرچاو گرتنی رۆڵی باڵای هەڤاڵ مام جەلال لە نزیك کردنەوەی بیروبۆچونە جۆراوجۆرەکانی ناو کۆنگرەکە، بڕیار درا کە وەفدی یەکێتی بە سەرۆکایەتی هەڤاڵ مام جەلال لە کۆنگرەکەدا بەشدار بێ.

"شایانی وتنە کە ئەندامانی تری وەفدی یەکێتی پێرێ بەرەو ئەنقەرە بە رێ کەوتن تا لەوێوە بچنە نیویۆرك." کوردستانی نوێ: ژ 1985 رۆژی 27 ی 10 ی 1999.

"دوای گەشتێکی سیاسی و دیپلۆماسی فراوان مام جەلال گەڕایەوە کوردستان

"لە هەفتەنامەی الاتحاد -ەوە

"دوای گەشتێکی سیاسی و دیپلۆماسی بۆ ئەمریکا و فەرەنسا و ئێران، ئێوارەی رۆژی پێنج شەممە 9 ی 12 بەڕێز مام جەلال سەرۆکی هەرێمی کوردستان گەڕایەوە خاکی نیشتمان.

"لەم گەشتەیدا، کە کۆتایی مانگی تشرینی یەکەمی رابردو دەستی پێ کرد و زیاتر لە مانگێکی خایاند، مام جەلال سەرۆکایەتی وەفدێکی فراوانی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستانی کرد بۆ بەشداری کردن لە کۆنگرەی فراوانی ئۆپۆزسیۆنی عیراق کە لە 29 / 10 تا 1 / 11 / 1999 لە نیویۆرك بەردەوام بو. هەروەها بە سیفەتی سیاسەتمەدارێکی دیار و سکرتێری گشتی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان، سەرۆکایەتی وەفدێکی بالای یەکێتیی کرد بۆ بەشداری کردن لە کۆنگرەی سۆسیالیستی نێودەوڵەتی کە لە 8 / 11 تا 10 / 11 / 1999 لە پاریس بەسترا.

"شایانی باسە مام جەلال لە گەشتەکەیدا بۆ ئەمریکا و ئەوروپا، چاوی بە ژمارەیەك لە لێپرسراوانی نەتەوە یەکگرتوەکان، لێپرسراوانی ئەمریکا و فەرەنسا کەوت.

"هەروەها چاوی بە گەورە لێپرسراوانی چەندین وڵات کەوت و لە گەڵ نوێنەر و سەرکردەی ژمارەیەك حیزب و رێکخراوی ئۆپۆزسیۆنی عیراق کۆبووەوە.

"لە کاتی گەڕانەوەشی لە ئەوروپا، هەڤاڵ مام جەلال سەردانی کۆماری ئیسلامی ئێرانی کرد و لەوێش چاوی بە چەندین لێپرسراو و دیپلۆماتی ژمارەیەك لە وڵاتانی جیهان کەوت." کوردستانی نوێ: ژ 2022 رۆژی 11 ی 12 ی 1999.

*

مام جەلال سکرتێری گشتی یەکێتی و فەرماندەی گشتی هێزی پێشمەرگەیە. سیستەمی راپەڕاندنی کاری یەکێتی کردۆتە سیستەمی سەرۆکایەتی. خۆی کردۆتە بەرپرسی یەکەمی مەکتەبەکانی رێکخستن، رێکخراوە دیمۆکراتیەکان، دارایی، راگەیاندن، کۆمەڵایەتی... هەریەکێ لەمانە بەرپرسێکیان هەیە بەڵام خۆی، نەك کەسی کە، بەرپرسی سەروی هەموویانە و خۆی رێنماییان ئەکا و فەرمانیان بۆ دەر ئەکا و لە هەمو کێشە گرنگەکاندا دوا بڕیاری لە دەستی خۆیدا هێشتۆتەوە.

بەراورد کردنی ژمارەی ئەو چەند حەفتەیەی ساڵی 1999 کە بە گەشتی سیاسی و دیپلۆماسیەوە، وەکو خۆی ناوی لێ ناوە، کوشتونی، لە گەڵ ژمارەی ئەو چەند حەفتەیەی تەرخانی کردوە بۆ کاروباری ناوەوەی کوردستان، وەکو سکرتێری گشتی و فەرماندەی گشتی و بەرپرسی هەمو مەکتەبەکانی یەکێتی و بەرپرسی حکومەت، دەری ئەخەن بۆچی پاشاگەردانی هەمو جومگەکانی دەزگا حیزبی و پێشمەرگەیی و حکومەتیەکانی هەرێمی گرتۆتەوە.

دەقی هەواڵەکان ئەگەر لە لایەن خۆیەوە دانەڕێژرا بێ، ئەوا خاڵە سەرەکیەکانی لە لایەن خۆیەوە دیاری کراون. گێڕانەوەی هەواڵەکان بە جۆرێکە هەمو جار بۆ پاساودانی هۆی سەفەرەکەی گرنگیەکی سیاسی زۆری بە گەشتەکەی داوە، لە کاتێکدا ئەو گەشتانە هەندێکی هیچ گرنگیەکی سیاسی یا دیپلۆماسی‌یان نەبوە. لە باتی ئەو نوێنەرەکانی یەکێتی لە دەرەوە یان دەستەیەکی نوێنەرایەتی هەڵبژێردراوی ناوەوە ئەیان توانی بچن و هەمان کار ئەنجام بدەن.

زۆر جار خۆی گەشتەکانی بۆ خۆی ساز ئەدا و، بۆنە و موناسەبەتی ئەدۆزیەوە و نوێنەرەکانی دەرەوەی رائەسپارد بۆ ئەوەی بیانوی سەفەر کردنی بۆ دابتاشن.

هەمو جار، پێش رۆیشتنی، چەندین سەعاتی کۆبونەوەکانی م س بە باسی زەرورەت و گرنگی ئەم سەفەرەوە ئەکوشت و هەمو جار، دوای هاتنەوەشی، چەندین سەعاتی تری کۆبونەوەی م س بە گێڕانەوەی سەرگروشتەی دورودرێژی سەفەرەکەی ئەکوشتەوە.

گوێگرەکان: ئەندامانی بەستەزمانی م س، چاری تریان نەبو جگە لە گوێ شل کردن، چاو هەڵ گڵۆفین، باوێشك دان، خەوەنوچکە.. دواییەکەی ستایشی گەشتە سەرکەوتوەکەی.

بۆ ئەنجامدانی سەفەرەکانی هیچ کات بیر و رەئی ئەندامانی م س رەچاو نەکردوە. ئەگەر جاروبار پرسە گورگانەی پێ کرد بن تەنیا بۆ ئەوە بوە ستایشی مێژویی بونی سەفەرەکە و گرنگی بونی لایەنی سیاسی و دیپلۆماسی گەشتەکەی بکەن بۆ مەسەلەی کورد. خۆی بڕیاری چون و نەچون و ماوەی مانەوە و کاتی گەڕانەوەی داوە.

لە سەفەرەکانی‌دا چی بە دەمی‌دا هاتبێ وتویەتی و، چی ویستبێ بە راگەیاندنی گەیاندوە و، بۆ هەرکوێیەکی ویستبێ چوە و کێی ویستبێ دیوێتی.

لە ترسی ئەوەی نەوەکو مام جەلال بچیتەوە بە گژیان دا و بیانشکێنێ و قسەی سوکیان پێ بڵێ کەس نەیوێراوە بڵێ:

- نابێ ئەم سەفەرە بکەی...

- ئەم سەفەرە لەم کاتەدا گرنگ نیە یا پێویست نیە، یا کاتەکەی لەبار نیە..

- پێویستە تۆ لێرە بی و ئەمجارە لە باتی تۆ یەکێکی تر یا وەفدێکی تر بچێ...

- ئەم قسەیە باش نیە و ئەم تەسریحانە داوتە بە دەزگاکانی راگەیاندن زەرەری هەیە بۆ یەکێتی...

## 5. داهێنانی سەرۆکایەتی هەرێم

### کۆسرەت: بەزاندنی خەتی سور

کۆسرەت بۆ راکێشانی لایەنگر، وەکو بۆ عیماد ئەحمەدی باس کردوە تیۆریەکی هەیە ئەڵێ: "لە شاخ مبادئ، لە شار مصالح". جا بە هۆی ئەو دەسەڵاتە زۆرەی دراوێتێ و ئەو پارە بێ حسابەی لە بەر دەستی دایە دەستی خستۆتە ناو هەمو داوودەزگا حکومەتی و حیزبیەکانەوە. ناو وەزارەتەکان و فەرمانگەکانی، م س و مەکتەبەکانی، مەڵبەندەکان، هێزەکانی پێشمەرگە، بە گفت و گەف هەوڵی داوە دڵسۆزی و گوێڕایەڵی زۆرترین ژمارەیان دابین بکا.

ژیان سەختە، دەرامەتی موچەخۆر کەمە، پێویستیەکان زۆرن و دابین کردنیان ئاسان نین. ئەم لاوازیەی دۆزیوەتە.

ژمارەیەکی زۆر لە بەرپرسەکانی یەکێتی و پێشمەرگە و حکومەت بۆ بەدەسهێنانی دەسکەوتێکی مادی: پارە، سەیارە، زەوی، خانو... رۆژانە سەردانی ئەکەن و دڵسۆزی خۆیان دەرئەبڕن.

کۆسرەت بەو پێوەندیەی لە گەل کادرەکان و خەڵك دروستی کردوە بایی بوە و لە خۆی گۆڕاوە. خۆی لە مام جەلال بە گەورەتر و بە بەهێزتر ئەزانێ. پێی وایە بە ئاسانی جێگەی ئەوی پێ ئەگیرێتەوە. تەنانەت لەم لا و ئەو لا بە ئاشکرا ئەپرسێ ئەگەر هەڵبژاردن بکرێ لە ناو خەڵك دا ئەم دەرئەچێ یان مام جەلال؟ کامیان رەئی زۆرتر ئەهێنن؟

ئەو وتارانەی لە بۆنەی جیاجیادا خوێندویەتیەوە، کۆی کردونەتەوە و لە کتێبێک دا، لە شێوەی ئەو کتێبانەدا کە بۆ ماوتسیتۆنگ و کیم ئێل سۆنگ و سەدام حسێنیان کۆ کردۆتەوە، چاپی کردوە.

مام جەلال لە چەند ساڵی رابوردودا هەمو شتێکی لە کۆسرەت قبوڵ کردوە و چاوپۆشی لە هەمو شتێکی کردوە و ئیستاش ئەیکا، ئەمە نەبێ. ئەمە بەزاندنی خەتی سورە. چونکە هەرگیز بیری لەوە نەکردۆتەوە یەکێکی تر جێگەی بگرێتەوە چ جای ئەوەی جێگەکەی داگیر بکا. لە لای مستەفای سەید قادر وتویەتی: "کۆسرەت سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیرانە و کارگێڕی مەکتەبی سیاسیە، چی تری ئەوێ؟ شوێنەکەی منی ئەوێ؟ نایدەمێ." بۆ ئەوەی سنورێ بۆ ئەمە دابنێ، لە باتی ئەوەی روبەڕو لە گەڵی بدوێ و بە راشکاوی قسەی لە گەڵ بکا، ئەویش لە لای خۆیەوە کەوتۆتە کار دژی کۆسرەت:

- لە کۆڕ و کۆبونەوە گشتیەکانی دەزگا رێکخراوەیی و پێشمەرگەییەکاندا دژی دەستەگەری و گەندەڵی ئەدوێ و باسی بژار و پاکسازی ئەکا، هەندێ جار بە ئاشکرا و هەندێ جار بە ژێرزارەکی پەنجە بۆ کۆسرەت رائەکێشێ. ئەم وتارانە لە کوردستانی نوێ و لە رادیۆ و تەلەفزیۆندا بڵاو ئەکرێنەوە.

- لە چەندین بۆنەدا و، لە بەر چاوی چەندین کەس، باسی ئەوە

ئەکا گۆیا "کۆسرەت کرمانجە و خەڵکی شار نیە" کە بە لەهجەی کۆیە ئەم وشەیە بۆ سوکایەتی پێکردنی پایەی کۆمەڵایەتی کۆسرەت بە کاری دێنێ.
- دەستی خستۆتە ناو وەزارەت و دەزگا کارگێڕیەکانەوە. جێگۆڕکێی بە هەندێ لە قایمقامەکان کردوە. لە کاتی کۆبونەوەی ئەنجومەنی وەزیراندا بە بەرچاوی کۆسرەتەوە بە تەلەفۆن قسە لە گەڵ وەزیرەکان ئەکا و تەعلیماتیان ئەداتێ.
*

7ی 6ی 99:
گۆڕینی دەستەی کارگێڕ
کارگێڕی م س تا ئیستا بریتی بون لە: کەمال فوئاد، کۆسرەت، عومەر فەتاح، ملازم عومەر، جەبار فەرمان. پێکەوە کۆ نەبونەتەوە هەریەکەیان بە جیا بۆ خۆی کاری کردوە. بە ناو و نازناو کارگێڕ بون بەڵام بە کردەوە 5 سەری سەربەخۆ بون.
مام جەلال کارگێڕی م س ی گۆڕیوە: کەمال فوئاد، قادری حاجی عەلی، حەمە تۆفیقی داناوە. ئەمانە گۆیا "متفرغ" ن و لە کۆسرەت ناترسن.
*

30ی 6ی 99:
گۆڕینی وەزارەت
مام جەلال بەرنامەیەکی بۆ کاری حکومەت داناوە. داوای گۆڕینی ئەو وەزیرانەی کردوە کە لە 3 ساڵ زیاتر لە پۆستەکانیاندا ماونەتەوە، بەڵام پێشنیاری کردوە کۆسرەت لە جێگەی خۆی بمێنێتەوە. بەرنامەکەی بۆ من ناردوە بیروڕای خۆمی لە سەر بنوسم. بەرنامەکەم لە کاتی خۆیدا ناردۆتەوە بۆ خۆی لە بەر ئەوە دەقە ئەسڵیەکەیم لە لا نەماوە تەنیا وەڵامەکەی خۆمم لە لا ماوە. بەرنامەکەی پرۆژەیەکە بۆ کاری لەمەودوای حکومەت، چەند لایەنێکی سیاسی، ئابوری، پێشمەرگەیی، رێکخراوەیی گرتبوەوە. ئەمە وەڵامەکەی منە:

برای گەورە و بەڕێزم مام جەلال
بە سپاسێکی زۆرەوە نامەکە و پرۆژەکەم وەرگرت. دەستەکانت خۆش.
وا لە خوارەوە سەرنج و تێبینەکانی خۆمت لە سەر بەندەکانی پرۆژەکە بۆ ئەنوسم:
یەکەم: هەڵوێستمان لە دەر و جیران
بە لامەوە پەسندە و هیچ تێبینیەکم نیە.
دوەم: چاکردنی وەزعی ئابوری خۆمان
لە سەر ئەمە هەندێ تێبینیم هەیە:
هەروەکو ئەزانی تەجروبەی وڵاتانی سۆڤیتی سەلماندیان کە

ئابوری کەرتی گشتی شکستی خوارد و ئابوری بازاڕ و مونافەسە گرەوی بردەوە. ئەم کۆمپانیا وەهمییانەی وەزارەتەکان و هەندێ لە برادەران دروستیان کردوە: 1. بازاڕی نارازی کردوە لە یەکێتی و دەرگای کاری لە ڕوی زۆر کەس دا داخستوە و، 2. قازانجەکەیشی زۆری بە فیڕۆ ئەچێتە گیرفانی ئەم و ئەوەوە، 3. ژمارەیەکی زۆر فەرمانبەری لێنەهاتو بە هۆی مەحسوبیەتەوە دامەزرێنراون.

ئەگەر ئەو پرۆژانە بە دەس کەرتی تایبەتیەوە بوایە ئەمانتوانی: باجی زۆرتر وەربگرین و معاش و ئیمتیازاتی ئەو تەعیینکراوانەشمان لە کۆڵ ئەبوەوە. بۆ نمونە ئەتوانین ئوتێلی ئەبو سەنا کە بە دەس کەرتی تایبەتیەوەیە و ئوتێلی ئاشتی و ئوتێلی سەرچنار و مۆتێلی چنار کە بە دەس کەرتی گشتیەوەیە بەراورد بکەین.

لە بەر ئەوەی ئەم کۆمپانییانە بێ کەفائەتن و بۆ مشەخۆری دروستکراون، زۆری ئەم پرۆژانە 3 جار ئەفرۆشرێتەوە و قازانجی لێ ئەخورێ سەرەنجام ئەدرێتەوە بە مقاویلێکی بازاڕ بەمەش ڕادەی باجەکە زۆر کەم ئەبێتەوە.

ئەگەر بازاڕ بە هێز و جوڵانی بازرگانی زۆر بێ، زۆر لەو کادرانەی ئێستا بە ناچاری بە موچەی یەکێتی ئەژین ئەوسا ئەتوانن ئیش بدۆزنەوە و خۆیان بژێنن، چونکە ئێستا ژمارەیەکی زۆر خەڵك یان لە ناو حکومەت دا، یان لە ناو یەکێتدا موچەخۆرن. ئەبێ نەخشە دابنێین بۆ ئەوەی ئاستی گوزەرانی کادرەکانی یەکێتی و بەرامبەرەکەی لە حکومەت و کەرتی تایبەتی دا وەکو یەك بن.

ئەوروپای سەرمایەداری سەلماندی ئەگەر وڵات ئابوریەکی تەندروستی هەبێ دەوڵەت بە تەنیا بە باج ئەتوانێ بژی.

مەسەلەیەکی گرنگ، موراعاتی سەرەتای موناقەصە و موزایەدەی نەزیە بکرێ لەم بوارانەی خوارەوەدا:

1. پرۆژەکانی بڕیاری 986 پێم وایە ئەتوانین زۆر شت بە سەر UN دا بسەپێنین چونکە ئەوە یارمەتی نیە بەڵکو پارەی نەوتی عیراقە.

2. بەکرێدانی مڵکەکانی دەوڵەت بە تایبەتی هی شارەوانی و دارایی و ئەوقاف بە موزایەدەی عەلەنی.

پێم باشە (نەسرییە) نەمێنێ و میزانیە دابنرێ.

زۆر گرنگە کە لیژنەی چاودێری دارایی ڕاستەوخۆ گرێدراوی خۆت بن بۆ ئەوەی پشتیوانییان بکەیت ئیجرائاتی قانونی لە سەر لێکۆڵینەوەکانیان بکرێ.

سێیەم: وەزعی ڕێکخستن

هەمو بۆچونەکان بە پەسند ئەزانم بەڵام لام وایە باشترە کە ئیشارەت بە زەرەری تکتل و پێویستی هەڵوەشاندنەوەی بکرێ و، هەڵبژاردن بکرێ بە سەرەتایەکی کار پێکراو لە هەمو ئاستەکان دا، کادرەکان بچنەوە ناو خەڵك و وەکو خەڵك بژین و ڕەفتار بکەن.

چوارەم: وەزعی ە پ ك

هەمویم بە لاوە پەسندە تەنیا ئەم تێبینییەم هەیە: ئەگەر بتوانین هیچ نەبێ تا ساڵێکی تر نەهێڵین توشی شەڕ ببن و مەشقیان پێ بکرێ و بدرێنە زابتە موحتەریفەکان و ئەوانەی دەورە تایبەتیەکان تەواو ئەکەن.

پێنجەم: وەزعی میری

هەمویم بە لاوە پەسندە.

لە کۆتایی دا حەز ئەکەم عەرزی جەنابت بکەم بۆ سەرخستنی ئەم بەرنامە ئیسلاحیە هەر کارێ بە من بسپێری بەوپەڕی دڵسوزییەوە ئامادەم بۆ جێبەجێ کردنی.

بە ئاواتی سەرکەوتنتانم

لە گەڵ ڕێزی بێ ئەندازەی برای دڵسۆزتان: نەوشیروان

سلێمانی 30 ی حوزەیرانی 1999

4 ی 7 ی 99:

نامەیەك دەربارەی گۆڕینی وەزیرەکان:

برای گەورە و بەڕێزم مام جەلال

سلاوێکی گەرم و هیوادارم هەر لە خۆشی دا بن

بە بۆنەی ئەو ئاڵوگۆڕانەوە کە بە دەستەوەیە لە وەزارەت دا بکرێن بە چاکم زانی هەندێ بیروبۆچونی خۆم تۆمار بکەم.

1. بە لای منەوە خەلەل لە سیستەمی حوکمڕانیەکەمان دا هەیە و ئەمەش ئەگەڕێتەوە بۆ ئەو سەردەمەی لە گەڵ پارتی دا هەم رەقیب و هەم هاوبەش بوین لە حوکمڕانی دا، ئەویش ئەوەیە کە ئێمە سەرۆکی دەوڵەتمان نیە. لەم قۆناغەدا من زۆر بە پێویستی ئەزانم کە دەسەلاتەکانی سەرۆکی دەوڵەت و دەسەلاتەکانی سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران لە یەکتری جیا بکرێنەوە بەم جۆرە:

1. 1. سکرتێری گشتی دەسەلاتەکانی سەرۆکی دەوڵەت بە کار بهێنێ. هێزی پێشمەرگە و دەزگای ئاسایش و دیوانی رەقابەی مالی ببەسترێن بە سکرتێری گشتیەوە.

1. 2. دەسەلاتەکانی سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران لە سەرفی پارە و بەخشینی ئەرز و خانو و سەیارە و دامەزراندنی موچەخۆردا دیاری بکرێ.

2. دو وەزارەتی تازە دروست بکرێ:

2. 1. لە باتی ئەنجومەنی خوێندنی باڵا وەزارەتێك بۆ خوێندنی باڵا دروست بکرێ، وەزیری خوێندنی باڵا پێویستە خاوەنی شەهادەی دکتۆرا بێ.

2. 2. دەزگای شەهیدان و دائیرەی تەقاعودی و زەمانی اجتماعی و عمل لە وەزارەتێکا بە ناوی وەزارەتی کاروباری کۆمەڵایەتیەوە کۆ بکرێنەوە.

3. چەند دەزگایەکی تازە دروست بکرێ:
3. 1. ئەنجومەنی پلاندانان لە کەسانی شارەزا دروست بکرێ بۆ ئەوەی بە یارمەتی پسپۆڕی بێگانە پلانی گەشە پێ دانی هەمە لایەنەی کورت خایەن و درێژخایەن بۆ کوردستان دابنێن.
3. 2. ئەنجومەنی (مجلس الخدمە) دروست بکرێ لە کەسانی لێوەشاوە و بێلایەن. ئەم ئەنجومەنە بە هەمو دائیرەکان دا بچێتەوە جارێکی تر پێوانەی ئیداری و قانونی بگێڕێتەوە بۆ ناو دائیرەکان. دامەزراندنی تازە، تەقاعود کردن، فەسڵ کردن، دیاریکردنی پێویست و فائیز ئەمان بیکەن.
3. 3. بۆ ئەوەی حکومەت نەتوانێ کار لە کارمەندانی دیوانی رەقابەی مالی بکا پێویستە ئەم دیوانە یەکسەر ببەسترێ بە سکرتێری گشتیەوە و ڕاپۆرت و لێکۆڵینەوەکانی بدرێ بەو نەك بە سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران. ئەندامەکانیشی لە کەسانی موحتەریف دروست بکرێ، پشتیوانی مادی و مەعنەوێ بکرێن. بکرێتە دو بەش یەکێکیان بۆ رەقابەی حکومەت و ئەوی تریان بۆ رەقابەی داوودەزگاکانی یەکێتی.

4. موستەشار و خەبیرەکان کە ئێستا لە وەزارەتەکان دا دانراون، مادەم لە بەر معاش دانراون، بۆ ئەوەی لە دائیرەکان دا جێگە داگیر نەکەن و دەستی نەشارەزایانە وەرنەدەنە کاروباری وەزارەتەکانەوە لەم وەزارەتانە لابرێن و، مانگانە لە شوێنێکی وەکو سکرتاریەت یان ئەنجومەنی وەزیرانەوە معاشەکەیان بدرێتی.

5. بۆ ئەوەی زەرەرمەندەکانی پرۆسەی چاککردنەوە، یەك نەگرن و نەکەونە پیلانگێڕان و، بۆ ئەوەی پرۆسەکە سەربگرێ و بەردەوام بێ، پێویستە زۆر بە شێنەیی و تەدریج و قۆناغ بە قۆناغ ئەنجام بدرێ. لەم قۆناغەدا تەرکیز بکرێتە سەر حکومەت کە ڕوی ئاشکرا و دەرکەوتوی حوکمڕانی یەکێتی‌یە لە ناو خەڵك دا.

لە گەڵ ڕێزی بێ ئەندازەی          برای دڵسۆزتان   نەوشیروان
سلێمانی 4 ی تەمموزی 1999

کێشەیەکی دەستوری و قانونی هەیە. هەمو جار کە کۆسرەت تەنگاو ئەکرێ بۆچی وازناهێنێ لە پۆستی سەرۆکایەتی ئەنجومەنی وەزیران و یەکێکی کە لە جێگەی ئەو ببێ بە سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران ئەوە ئەکا بە بیانو کە لە سەرو ئەوەوە دەسەڵاتێکی قانونیی بەرزتر نیە تا ئەم "استقالە" کەی خۆی بداتێ یان ئەو بتوانێ ئەم

"اقالە" بکات. ڕاستیەکەی بە هۆی دو ئیدارەیی و نەمانی دەسەڵاتی پارلەمان لە سنوری دەسەڵاتی یەکێتی دا بۆشاییەکی دەستوری دروست بوە. کێ ئەو لایەنەیە کەسێ بۆ سەرۆکایەتی ئەنجومەن تەکلیف ئەکا یا لا ئەبا؟

*

1ی 8 ی 1999:

نامەی د فوئاد مەعسوم: دەراوی قانونی

د فوئاد مەعسوم نامەیەکی بۆ مام جەلال ناردوە داوای لێ کردوە دەسەڵاتەکانی بکاتە "حەقیقەتی مادی". مام جەلال نامەکەی بە تەعلیقێکی خۆیەوە ناردوە بۆ قادری حاجی عەلی تا دابەشی بکا بە سەر ئەندامانی م س دا. ئەمەش دەقی نامەکە و تەعلیقەکەیەتی:

جەنابی مام جەلالی بەڕێز

سەلاوێکی گەرم خۆشیتان هیوامە

لێم ببورە لەو نامەیەدا هێندێ بۆچونی خۆمتان عەرز دەکەم کە مەبەستم سەرکەوتن و بەهێزکردنی یەکێتی‌یە و پەیدابوونی مەرکەزیەت و، رۆڵی جەنابتانە.

گەر بێتەوە بیرتان لە هەشتاکاندا جارێک بە جەنابتم گوت لە دانیشتنێکی دوقۆڵیدا کە جەنابت لە ناو یەکێتی‌دا دەسەڵاتەکەت مەعنەویە، دەبێ ببێ بە حەقیقەتێکی مادی، بۆ ئەوەی زەبتی ململانێ بکەیت.

ئیستا من زۆرم پێ خۆشە، کە دەست و بازوت لێ هەڵکردوە، لەمێژە دەمویست وەها بی. ئیجرائاتەکانت زۆر باشن، ململانێ سنوری هەبێ، لە جغزێکی دیاریکراودا بێ، کە ناوی لێ بنێین مونافەسە. دەتوانم بڵێم ئیستا گەیشتوەتە حدی خۆی.

ئەوجا نۆرەی اصلاحات هاتوە، دەستی پێ بکەیت، تکام وایە چەند کەسانێکی شارەزاش دەست نیشان بکە ئیش و کاریان تخطیط بێ بۆ ئەو اصلاحاتانە نەک هەنگاوێک بهاویین و دوایی تراجعی لێ بکەین لە بەر هێندێ اعتبارات، ئەم پسپۆڕانە هەموو لایەنی ئەو هەنگاوانە لێک بدەنەوە پێش ئەوەی اعلان بکرێ.

لام باشە هەنگاوەکانی کە دەهاویشترێن پێش ئەوەی اعلان بکرێ هێندێ لە برادەران بە تایبەتی ئەوانەی لە ناو یەکێتی دیارن و خەڵک باسی ململانێیان دەکا پرس و رایان پێ بکرێ پێش ئەوەی اعلانی بکەیت راستەوخۆ یا بیهاویە بەردەم کۆبونەوەی م. س یا سەرکردایەتی تا التزامیان مسۆگەرتر بێ و قسەی ئەولاوئەولا نەکەن.

دوا قسەم لێرەدا: ان جاءکم .... هەمیشە ئەو فلتەرە بێ کە تصفیەی هێندێ قسەگێڕانەوە دەکا.

هومێدی موەفەقی و سەرکەوتنت بۆ دەخوازم لە هەمو هەنگاوەکانت.

خودا بتانپارێزێ

99\7\26 دلسۆزتان فوئاد

لە ژێر نامەکەدا مام جەلال ئەم تەعلیقەی نوسیوە:

کاک قادر

سڵاو بیدەرە هەڤاڵانی م. س تکایە بە فۆتۆکۆپی کراوی هەریەکە دانەی خۆی.

هەڤاڵانی م. س/ی بەڕێز سڵاوێکی گەرم

بۆ ئەوەی بتوانم ئەوەی کاک د. فوئاد پێشنیاری دەکات ئەنجامی بدەم پێویستیم بەم شتانەی خوارەوە هەیە جگە لە هاوکاری و پشتیوانی کۆمەڵانی خەڵک و ە پ ک و ئەندامان و کادرانی ی. ن. ک کە زۆر بە گەرمی پێشوازی لە گەشەپێدان دەکەن:

یەکەم/ هاوکاری بە دڵو بە گیانو بە حەماسی ئیوە. نەک هاوکاری سەرزارەکی و هەر سەر کاغەز و ناوکۆبونەوەکان.

دوەم/ دوای ئەوەی ناوی (رێبەر) تان بە سەردا بڕیووم و سەبارەت بەوەی کە سکرتێری گشتی و فەرماندەی گشتیم و هەمو دەسەڵاتێکتان پێ داوم، بۆ بە قانونی کردن و پەلەکردن لە جی بە جێ کردنی ئیسڵاحەکان بە پێویستی دەزانم بیکەن بە بڕیاریش کە صلاحیاتی قانوونی رێبەر بە کار بهێنم وەک لە قانونی ژمارە (2) دا هاتووە. بە تایبەتی کە من پتر لە سەداهەفتای دەنگی خەڵکی ناوچەی رزگاری بن دەستی خۆشمانم هێناوە.

سێیەم/ حەملەیەکی فیکری بەربڵاو بکەین بۆ نیشان دانی ئەهمیەتی چاک کردن و گەشە پێدان و دژی تەکەتولات.

چوارەم/ دەست بە جێ بڕیاری دانانی (مجلس الخدمە) و (مجلس التخطیط) بدەن بۆ گەشە پێدانی حکومەتەکەمان و حوکمی قانوون.

هەر بژین بۆ برای دلسۆزتان (ئیمزای مام جەلال)

6 ی 8 ی 99:

**گەمەکەی هەیاسی خاس**

نیوەڕۆی ئەمڕۆ مام جەلال هات بە کراوەیی قسەمان کرد.

من وتم: "ئیسڵاحاتی نیوەوناچڵ زەرەری زۆرترە لە قازانج وەکو ئەوەیە لە نەشتەرگەری‌دا سکی نەخۆشەکە هەڵدڕی بەڵام نەیدرویتەوە و بە کراوەیی بە جێی بهێڵی. ..."

پاش هەندێ قسەو باس داوای لێ کردم لە کۆبونەوەکانی م س دا بەشدار بم. وتم: "لە ناو م س دا 9 کەسیان من بە دوژمنی خۆیان ئەزانن چونکە لایان وایە ئەمەی تۆ ئەیکەیت بە هاندانی منە. بونی من لە ناو هەیئەتێکی وەهادا چ سودێکی هەیە؟"

وتی: "وایە ئەمەی من ئەیکەم بە تۆی ئەزانن تەنانەت کۆسرەت

تەلەفۆنی بۆ د فوئاد و د بەرهەم کردوە وتویەتی مام جەلال بە فیتی نەوشیروان کەوتۆتە دوژمنایەتی من. بەڵام بۆ ئەوەی تەنیا نەبم ئەگەر بۆ هەمو کۆبونەوەکانی م س نایەیت ناو بە ناو ئامادە بونت بۆ ترساندنیان شتێکی باشە."

مام جەلال بەردەوامە لە سەر گەمەکەی هەیاسی خاس.

*

بەر لە چەند رۆژێ کۆسرەت چۆتە لای مام جەلال پاکانەی بۆ کردوە. وتویەتی: "من وەکو بافڵ دابنێ. وتوتە ئەبێ سەری لە بەرد بدا چ بەردێك ئەڵێی سەری لێ ئەدەم. نەوشیروان تۆڵەی کۆنگرەم لێ ئەکاتەوە. لە کۆنگرەدا ویستی تۆ لا بدا داوای پشتیوانی لە من کرد بەڵام من پشتی تۆم گرت. ئیستاش ئەیەوێ من بە تۆ لا ببا و دوایی خۆیشی تۆ لا ببا."

*

11 ی 8 ی 99:

دەستەی کارگێڕ ئەم نامەیەی دابەش کردوە بە سەر ئەندامانی م س دا:

"بەرنامەی پێشنیازکراو بۆ کۆبونەوەی داهاتوی مەکتەبی سیاسی رۆژی پێنج شەمە 12 ی 8 ی 1999 کات 7 ئێوارە لە بارەگای مەکتەبی سیاسی لە قەڵاچوالان:

1. لێکۆڵینەوە و بڕیاردان لە سەر پێشنیازەکانی بەڕێز مام جەلال لە سەر نامەکەی بەڕێز کاك د فوئاد لە 26 ی 7 کە تێیدا پێشنیاز کراوە دەسەڵاتی رابەر بدرێتە بەڕێز مام جەلال بە پێی مادە 2 ی یاسا، بە تایبەتی بۆ پەلەکردن لە ریفۆرم و ئاڵوگۆڕ کردنی پێویست لە هەمو بوارەکاندا.

2. کات دیاری کردن بۆ جێبەجێ کردنی بڕیارەکانی کۆبونەوەی پێشوی مەکتەبی سیاسی لە 31 ی 7 ی 1999 بە تایبەتی لە بارەی دامەزراندنی (ئەنجومەنی پلاندانان: مجلس التخطيط) و (ئەنجومەنی خزمەت: مجلس الخدمە) دوە.

3. لێکۆڵینەوە لە بارەی وتووێژەکانی نێوان یەکێتی و پارتی لە هەندەران و لە وڵات.

4. دۆزینەوەی چارەسەرێکی شیاو بۆ دادگای سلێمانی و بڕیاردان لە سەر دامەزراندنی (ئەنجومەنی دادوەری: المجلس القضائی) و (دادگای تەمیز: محکمە التمیز)

*

12 ی 8 ی 99:

سلێمانی، سەعات 7 ی ئێوارە لە ماڵی مام جەلال کۆبونەوەی م س کرا بە ئامادە بونی: مام جەلال، کۆسرەت، جەبار فەرمان، کەمال فوئاد، قادری حاجی عەلی، حەمە تۆفیق، فەرەیدون، شێخ محەممەدی شاکەلی، ئەرسەلان، عیماد، ملازم عومەر، عومەر فەتاح، من.

بەرنامەی پێشنیازکراوی کارگێڕ باس کرا.

بڕیار درا مام جەلال بە پێی قانونی ژمارە 2 دەسەڵاتەکانی ڕێبەری بزوتنەوەی رزگاریخوازی کوردی بدرێتی و ئەم بڕیارە لە لایەن چەند قانونیەکەوە دابڕێژرێ.

بڕیار درا مجلسی خدمە دابنرێ.

بڕیار درا ئەنجومەنی پلاندانان دابمەزرێ.

بڕیار درا وەزعی دادگاکانی سلێمانی باش بکرێ و ئەگەر بتوانین دادگای تەمیز و ئەنجومەنی دادوەری و مەعهەدی دادوەری بۆ پێگەیاندنی حاکمی گەنج دابمەزرێ.

بڕیار درا ئەو وەزیرانەی 3 ساڵیان تەواو کردوە بگۆڕێن بە هی نوێ.

ئیتر مام جەلال کەوتە بە کارهێنانی دەسەڵاتەکانی قانونی ژمارە (2) بەڵام لە بەر ئەوەی هەر لە سەرەتاوە ئێمە هەندێکمان ناوی "رابەر" مان بە لاوە پەسەند نەبو ناوی "سەرۆکی هەرێم" ی لێ نرا بۆ ئەوەی "مەرجەع" ێکی قانونی هەبێ لە کاتی پێویست دا رۆڵی خۆی ببینێ.

تەعدیلی وەزاری

کوردستانی نوێ، لە ژ 1930 رۆژی 1999/8/22. هەواڵەکەی بەم جۆرە گێڕاوەتەوە:

"لە کۆنگرەیەکی رۆژنامەنوسیدا: سەرۆکی حکومەت گۆڕانکارییەکانی کابینەکەی راگەیاند

"نیوەڕۆی دوێنێ 21 ی 8 ی 1999 بەڕێز کۆسرەت رەسول عەلی سەرۆکی حکومەتی هەرێمی کوردستان لە دیوانی سەرۆکایەتی ئەنجومەنی وەزیراندا، لە کۆنگرەیەکی رۆژنامەنوسی تایبەتدا، چەند گۆڕانکاریەکی کابینەی حکومەتی هەرێمی کوردستانی راگەیاند.

"لەو کۆنگرە رۆژنامەنوسیەدا کە هەر یەك لە بەڕێزان عومەر عەبدوڵڵا جێگری سەرۆکی حکومەت و عیماد ئەحمەد وەزیری پیشەسازی و مستەفا سەید قادر وەزیری ناوخۆ ئامادەی بون، سەرۆکی حکومەت دوای ئەوەی ئاماژەی بە ئامانجەکانی ئەم گۆڕانکارییانە کرد کە گۆڕانکاریە لە پێناو گەشەپێدانی ی ن ك و حکومەتی هەرێم دەکرێن کە هەر یەك لە وەزارەتەکانی تەندروستی و کشتوکاڵ و پیشەسازی و رۆشنبیری و مرۆڤایەتی و گواستنەوە و گەیاندن دەگرێتەوە، هەروەها رایگەیاند کە حکومەتی هەرێم بڕیاری دا بە یەکخستنی هەردو وەزارەتی ئیشغال و ئاوەدانکردنەوە لە یەك پۆستدا و بڕیاری دا بە هەڵوەشاندنەوەی پۆستی وەزیری هەرێم و دامەزراندنی وەزارەتێکی نوێ بە ناوی وەزارەتی خوێندنی باڵا و پێکهێنانی ئەنجومەنی خزمەت و ئەنجومەنی پلان دانان و ئەنجومەنی قەزا. هەر بەم بۆنەیەوە بەڕێزی بە ناوی خۆی و وەزیرە بەڕێزەکان سوپاس و ستایشی ئەو وەزیرە بەڕێزانەی کرد کە لە ماوەی چەند ساڵی رابوردودا سەرکەوتوانە کارەکانیان راپەڕاندوە و خزمەتی

بێ وچانیان پێشکەش بە میللەتەکەیان کردوە.

"پاشان لە کۆتایی لێدوانە رۆژنامەنوسیەکەیدا ناوی ئەو بەرێزانەی ئاشکرا کرد کە پۆستی وەزارەتەکانیان پێ سپێردراوە، لەم بارەیەوە رایگەیاند کە بڕیار دراوە بە دانانی بەرێزان عەدنان موفتی بە وەزیری شارەوانی و د جەمال فوئاد بە وەزیری مرۆڤایەتی و د یادگار بە وەزیری تەندروستی و برزو عەلی هەژار بە وەزیری گواستنەوە و گەیاندن و عادل ناسر بە وەزیری کشتوکاڵ و شێخ محەمەد شاکەلی بە وەزیری رۆشنبیری و د جەلال شەفیق بە وەزیری خوێندنی باڵا و د کەمال خۆشناو بە سەرۆکی زانکۆی سلێمانی."

29 ی 8 ی 99 یەکشەم:

چوم بۆ بینینی مام جەلال بۆ باسی پرۆژەیەك کە دەربارە نیشتەجێکردنی ئاوارەکانی کەرکوك نوسی بوم و پێشتر بۆم نارد بو. ئەو پرۆژەیەم بە هاوکاری چەندین کەسی کەرکوکی و شارەزای بواری جیاجیا ئامادە کرد بو.

لە میانەی قسەدا باسی ساردی نێوان من و کۆسرەتی کرد و گلەیی لێ کردم کە بۆچی باسم کردوە. من بە کراوەیی پێم وت کە من دژی کۆسرەت نیم بەڵام ئەو لای وایە هەمو هەنگاوێ لە رێی ئیسلاحات دا موئامەرەیە لەو و، هەرچیەکی پێ کرا بێ دژی من درێخی نەکردوە.وتم:

- وەختێ حکومەتی هەرێمان تەسلیمی دەستی ئەم برادەرە کرد یەکێتی هەر لە زاخۆوە تا کفری بە دەستەوە بو، ئێستا ئەوەتا خۆی و حکومەتەکەی بە ئاوارەیی لە سلێمانیین.

- لە سەردەمی حکومەتەکەی ئەم برادەرەدا یەکێتی توشی شەڕێ بوە لە گەڵ پارتی بە هەمو زلهێزەکانی دنیا ناکوژێتەوە.

- لە سەردەمی حکومەتەکەی ئەم برادەرەدا 2 سەد هەزار کوردی عێراق کوردستانیان بە جێ هێشتوە لەوانە زیاتر لە 2 هەزاریان کادری یەکێتی بون و زیاتر لە 2 سەد کەسیان مامۆستای زانکۆ بون.

- لە سەردەمی حکومەتەکەی ئەم برادەرەدا هەمو ماڵ و دارایی حکومەتەکە بە فیرۆ رۆیشت. وەزارەتەکان تاڵان کران و زەوییەکان و خانوەکانیان بە بەلاش دران بەموئەو و بە زۆری بە کەسانی ناموستەحەق و، مەکینە و سیارەکانیان فرۆشران بە ئێران.

ئیتر ئەم کابرایە ئەبێ شانازی چیمان بە سەردا بکات؟

## 6. بابەتی جۆراوجۆر

### ژوری بازرگانی

سلێمانی 25 ی ئابی 99
گەورەی بەڕێز مام جەلال
سلاوێکی گەرم

هەروەکوئەزانن ژوری بازرگانی لە جولاندن و ڕێکخستنی بازاڕ و بازرگانیدا دەورێکی کاریگەری هەیە، بەلام ئەوە چەند سالێکە ئەم ژورەی سلێمانی لە کار کەوتوە. پێویستی بە زیندوکردنەوە و بە گەڕخستن هەیە:

1. کاتی خۆی سەرۆك و ئەندامانی ژوری بازرگانی سلێمانی بەم جۆرە بوە:

سەرۆك رەفیق قەزاز مردوە
جێگری سەرۆك زاهیر حاجی ئەحمەد کوژراوە
ئەندامی بەریوەبەرایەتی عەبدوللای حاجی فەرەجی سوسێ مردوە
ئەندامی بەریوەبەرایەتی ئیسماعیل حەداد چوە بۆ خاریج
ئەندامی بەریوەبەرایەتی عومەر نوری حەمەسور ئیستیقالەی کردوە
ئەندامی بەریوەبەرایەتی حەمەی زێوەر ئیستیقالەی کردوە
ئەندامی بەریوەبەرایەتی مستەفای رازاوە ئیستیقالەی کردوە
ئەندامی بەریوەبەرایەتی صەباح ئەحمەد کەریم ئیستیقالەی کردوە
ئەندامی بەریوەبەرایەتی ئەمین شەوکەت ماوە

2. کاتی خۆی جگە لە سەرۆك و، جێگری سەرۆك، مدیری ادارەیشیان هەبوە. مدیری ادارە بە پێی نیزامی ژورەکە ئەبێ دەرچوی جامیعە بێ و 4 سال خزمەتی لە ناو ژورەکەدا هەبێ.

3. ئێستا ئەمانە: سەرۆك، جێگری سەرۆك، ئەندامانی دەستەی بەرێوەبردن، مدیری ادارە هیچیان نەماون. تەنیا کەس کە ماوە و هەمو ئیشەکان ئەکا کاك ئەمین شەوکەتە. بە پێی نیزامی ژورەکە سەرۆك و جێگرەکەی و ئەندامانی دەستەی بەرێوەبەر نابێ موچەخۆر بن، بەلام کاك ئەمین موچەخۆرە.

4. لەو ماوەیەدا بە جۆرێکی نائاسایی چەند کەس کراون بە ئەندام و لە صنفی بەرزی بازرگانیدا دانراون بۆ ئەوەی بتوانن قۆنتەرات

وەربگرن کاتی خۆی هیچ پێوەندییەکیان بە بازاڕ و بازرگانیەوە نەبوە.

5. ماوەیەك پێش ئێستا هەندێ لە ئەندامانی ژوری بازرگانی کۆبونەوەیان لە گەڵ جەنابت کردوە و هەندێ لە کێشەکانیان باس کردوە. بە تەما بون رۆژی 20 ی 4 ی 99 هەڵبژاردنی ژوری بازرگانی بکرێ بەڵام بە جۆرێکی چاوەڕوان نەکراو دواخراوە بۆ کاتێکی نادیاریکراو.

6. کاتی ئەوە هاتوە جەنابت فەرمان بدەی ئەم ژورە بە گەڕ بخرێتەوە و هەڵبژاردنێکی پاك و ئازادی تێدا بکرێ بۆ ئەوەی لە ژیانی ئابوری‌دا دەوری خۆیان ببینن.

لە گەڵ رێزی بێئەندازەی نەوشیروان

وێنەیەکی بۆ بەڕێز کارگێڕی م س بۆ ئاگاداری

**دادگا**

سلێمانی 3 ی ئابی 999

برای گەورە و بەڕێزم مام جەلال

سڵاوێکی گەرم

هیوادارم هەمیشە لە خۆشی دا بن

چەند جارێ چەند کەسێکی قانونی و نائیبی مدعی عام هاتونەتە لام بۆ دەربڕینی هەندێ سەرنج و تێبینی تا بە جەنابتی بگەیەنم. وا لە خوارەوە پوختەکەیتان ئەخەمە بەرچاو هیوادارم کەڵکێکی هەبێ و خۆت کە پیاوێکی قانونیت گرنگیی دادگا بێگومان لە خەڵکی کە باشتر ئەزانی.

1. وەزعی ناو دادگای سلێمانی باش نیە چونکە حاکم شێخ لەتیف و حاکم عەبدولکەریم ناکۆکن. بەو هۆیەوە دەزگای مەحکەمە بۆتە دو تکتلی دژ بە بەیەك و دژی یەکتری ئەدوێن و کار لە یەکتری ئەشێوێنن.

ئەم کێشەیە بەوە چارەسەر ئەکرێ کە ئەم دو حاکمە ئاشت بکرێنەوە و رێکبخرێنەوە چونکە هەردوکیان بە کەڵکن بۆ دادگاکانی سلێمانی.

2. هەیبەتی دادگا کەم بۆتەوە. تا ئێستا چەند جارێ لەبەردەمی دادگادا تەقە بوە و جارێکیش یەکێ کوژراوە. بیناکەیشیان پچوکە و پاك و خاوێن نیە. بۆ ئەوەی هەیبەتی دادگا بە هێز بکرێ پێویستە:

أ. ژمارەیەکی باش پۆلیس بۆ دابینکردنی ئاسایشی ناوەوە و دەرەوەی دادگا تەرخان بکرێ.

ب. حیمایە بۆ حاکمەکان دابنرێ.

ج. خاوێنی بیناکە و دیوارەکانی رابگیرێ.

د. بیناکەی پشتی دادگا کە هی بلدیاتە بدرێ بە مان.

3. وەزعی محکمەی تحقیق باش نیە چونکە:

أ. تەنیا یەك حاكم تحقیق هەیە و مەسەلەكانی لە سەر كەڵەكە ئەبێ.
ب. محكمە اجهزەی تحقیقی نیە وەكو: مختبر الادلە الجنائیە، جهاز طبع الاصابع، جهاز كشف السلاح...
4. بۆ پێگەیاندنی حاكمی گەنج ئەتوانرێ معهد القضاء لە سەر شێوەی مەعهەدەكەی بەغداد دابمەزرێنرێ. لە سلێمانی ئیمكانی ئەمە هەیە.
5. بۆ ئەوەی سەربەخۆیی قانونی خۆمان هەبێ و مادەم بەرەو خۆ جیاكردنەوە ئەچین لە پارتی پێویستە محكمەی تمییزی خۆمان لە سلێمانی هەبێ.
6. عفوی خاص بۆ هەندێ تاوانبار دەرچوە ئەمە شتێكی باش نیە بۆ سومعەی محكمە. ئەمە یا نەهێڵرێ یان زۆر كەمتر بكرێتەوە.
7. ئێستا 37 نائیبی مدعی عام هەیە لە گەڵ سەرۆك و جێگرەكەی ئەبن بە 39 كەس. ئەم ژمارەیە زۆرە و هەندێكیان ڕەنگە هێشتا بە كەڵكی ئەم ئیشە نەیەن چونكە بە واسیتە دانراون. مەرجەكانی مدعی عام بە گوێرەی قانونی عیراقی ئەبێ: عیراقی بێ، متزوج بێ، لایەنی كەم 3 ساڵ خزمەتی هەبێ و 2 ساڵیش لە معهد القضاء خوێندبێتی.
لە گەڵ ڕێزی بێئەندازەی نەوشیروان

**تەعدیلی قانونی عقوبات و**

**قانونی ئەحواڵی شەخسی**

برای گەورە و بەڕێزم مام جەلال
سڵاوێكی گەرم و هیوادارم هەمیشە لە خۆشیدا بن
كاك روشدی تعدیلی قانون العقوبات ی تەواو كردوە. پێكەوە دانیشتین و سەر لە نوێ هەمو ئەو ماددانەی تعدیل یان تجمید كراون خوێندەوە و موناقەشە كرد و لە سەری رێك كەوتین. زۆر بە وردی و رێكوپێكی قانونەكەیان بژار كردوە. وا مسوەدەكەی ئەنێرمە خزمەتتان تكام وایە سەیری بكەن و هەر ئاڵوگۆڕێ بە پێویست ئەزانن بیكەن.

ئەم قانونە دوای ئەم تعدیل و تجمیدانە هێشتا دو نوقسانی تیایە:
1. ئەو غەرامەیەی دانراوە زۆر كەمە چونكە بە پێی دەسكەوتی رۆژانەی ساڵی 1969 دیاری كراوە. نوسراوە ساڵێك حەپسی یان سەد دینار غەرامە. دەسكەوتی رۆژانەی كرێكاری (غیر ماهر) ئەوسا لە نیو دینار كەمتر بوە ئێستا لە پەنجا دینار زیاترە. ئەبێ بەو پێیە دەسكاری بكرێ.
بۆ ئەم مەبەستە كاك روشدی بە تەمایە شتێك ئامادە بكا كە لە گەڵ هەلومەرجی ئێستا بگونجێ و دادگاكان كاری پێ بكەن.
2. هیچ ماددەیەكی تیا نیە بۆ سزادانی ئەو قاچاغچییانەی لێرەوە

خەڵك ئەبەن بۆ ئەوروپا و دەستیان ئەبڕن یان دەستدریژییان لێ ئەکەن. بۆ ئەمەش ئەبێ چەند ماددەیەك هەبێ كاك روشدی ئامادەی ئەکات.

بە گشتی ئێستا قانونەکە بژار کراوە لەو ماددانەی کە لە گەڵ مافەکانی مرۆڤ دا ناگونجێن و ئامادەیە بۆ پەسند کردن و کار پێ کردن ئەگەر جەنابت بە پەسندی بزانی.

لە گەڵ ڕێزی بێئەندازەی نەوشیروان مستەفا

سلێمانی 20 ی تشرینی یەکەمی 1999

گەورەی بەڕێز

سەرۆکی هەرێمی کوردستان

پاش سڵاو

1. لە سەر داوای کاك روشدی عەزیز لە مانگی کانونی یەکەمی ساڵی پاردا بۆ لێکۆڵینەوەی قانونی ئەحوالی شەخسی چەند جارێ دانیشتین. بەندە بە چاکم زانی کە ژنێکی شارەزایش بانگ بکەین بۆ ئەوەی لە بیروڕای ژنانیش ئاگادار بین و، یەکێ لە خۆیان بەشداری گفتوگۆکان بکا. بۆ ئەو مەبەستە خاتو هاوژین مەنمی‌مان بانگ کرد کە لە سکرتاریەتی یەکیتی ژنان و، لە سەنتەری راگەیاندنی ژنان و، سەرنوسەری رۆژنامەی ژیانەوەیە. خاتو هاوژین پێشتر مادە بە مادەی قانونەکەی بە وردی دراسە کرد بو و، شارەزاییەکی باشی هەبو لەو بوارەدا و، کەڵکی زۆرمان لێ وەرگرت.

2. لە زنجیرەیەك گفتوگۆدا قانونەکەمان مادە بە مادە تاووتوێ کرد. بیروڕای نوێنەری ژنان لە هەندێ مەسەلەی زۆر گرنگ و حساس دا جیاواز بو لە هی ئێمە. هەمو ئەو ماددانەی بە پێی نصی صریحی قورئان دانراون، ئێمە دەسکاریمان نەکردن و، وەکو خۆی هێشتمانەوە. ئەوەی دەسکاریش کرابێ هەوڵ دراوە لە گەڵ گیانی قورئان دا ساز و گونجاو بێ.

وا مسودەی تعدیلەکان ئەنێرمە خزمەتتان.

3. ئەوەی نوێنەری ژنان لەم قۆناغەدا داوای گۆڕینی ئەکەن هەموی بە ئێمە جێبەجێ ناکرێ، بە تایبەتی کە ئێستا ئیسلامی سیاسی لە گەشە کردن دایە و، سنوری دەسەلاتی ئێمەش تەسك بۆتەوە، بەڵام ناکرێ هەمو داواکانیان لەم چەرخەیش دا پشت گوێ بخرێن. مستەفا کەمال سەرەتای بیستەکانی قەرنی رابوردو لە تورکیای ئەوسادا، کە لە کوردستانی ئێستا دواکەوتوتر بو، خەلافەتی لەغو کرد و جمهوریەتی لە جێ دامەزراند و، شەریعەتی لەغو کرد قانونی مەدەنی خستە جێگەی و، دنیایش وێران نەبو.

ئێمەیش پێویستە هەندێ هەنگاو بنێین لە سەر رێی کەمکردنەوەی تەئسیری لایەنە کۆن و نەگونجاوەکانی شەریعەت لە سەر قانونەکانی

ئەم زەمانە، بە تایبەتی ئەوانەی پێوەندییان بە ژیانی کۆمەڵایەتی و شارستانیی خەڵکەوە هەیە.

4. یەکێ لەو مەسەلە گرنگانەی کە نوێنەری ژنان پێی لە سەر داگرت، مەسەلەی فرە هاوسەری پیاوە، کە لێرەدا ئێمە بە (معلق) ی هێشتومانەتەوە بۆ ئەوەی جەنابت دوابڕیاری لێ بدەی. ئەگەر ئەم بڕیارە بدرێ چەند مادده و فەقەرەیەکی قانونەکە ئەبێ لەغو بکرێن یان دەسکاری بکرێن.

من خۆم لایەنگری ئەوەم فرەهاوسەریی پیاو بە تەواوی بە پێی قانون لەم قەڵەمڕەوەی ئێمەدا قەدەغە بکرێ و، پیاو بۆی نەبێ لە یەك هاوسەر زیاتری هەبێ.

5. مەسەلەی تەڵاق کە نوێنەری ژنان پێی لە سەر دائەگرت بە دەس هەردولا بێ و، بەرامبەر بەوە ئامادە بون دەس لە مارەیی و نفقە هەڵبگرن، ئێمە موافەقەتمان لە سەر نەکرد.

6. ئەگەرچی نوێنەری ژنان پێی لە سەر ئەوە دائەگرت کە کچ و کوڕ لە میرات گرتن دا یەکسان بن، بەڵام ئەمیش ئێمە موافەقەتمان لە سەر نەکرد و، وەکو خۆی هێڵرایەوە.

7. لە هەندێ جێگە باسی ئەهلیەتی شەرعی و قانونی کراوە. بەندە لام وایە بە تەنیا ئەهلیەتی قانونی کافیە و پیویست بە شەرعیەکە ناکات، چونکە:

أ. ئەمە چەکێکی کوشندە ئەبێ بە دەس ئیسلامیەکانەوە بۆ سەندنەوەی ئەهلیەت لە هەمو ئەوانەی یەکێ لە فەریزەکانی ئیسلام، وەکو نوێژ، رۆژو، حەج، زەکات... بە جێ ناهێنن.

ب. هەمو قانونەکانی عیراق بە پێی شەرع دارێژراون، لە بەر ئەوە کە قانونی بو شەرعیشە.

لە گەڵ رێزی بێئەندازەی     نەوشیروان مستەفا
سلێمانی، 3 ی 1 ی 2000

## دەزگای ئاسایش

گەورەی بەڕێز
سەرۆکی هەرێمی کوردستان
پاش سڵاو

لەم کاتەدا کە بەڕیزتان بڕیارتان داوە هەمو قانونەکانی عیراق دەسکاری بکرێن و بگونجێنرێن لە گەڵ جاڕی گەردونی مافی مرۆڤ دا بەندە بە چاکی ئەزانم هەندێ بیروبۆچونی خۆم سەبارەت بە دەزگاکانی ئاسایش و پۆلیس و دادگا، لە وڵاتەکەمان دا بخەمە بەرچاوی بەڕێزتان:

1. بە داخەوە ئەوەی من لە سەر دەزگای ئاسایش بیستومە،

دەزگای ئاسایش لە ناو خەڵك دا خۆشەویست نیە، بەڵکو بۆتە دەزگایەکی ئیرهابی، هاووڵاتی ئاسایی، بە تایبەتی ئەوانەی کە پشتیوان و واسیتەیان نیە، لێی ئەترسن.

2. دەزگای ئاسایش لە کاروباری تایبەتی هاووڵاتییان و تەنانەت لە ژیانی تایبەتییان دا تەدەخول ئەکەن.

3. فۆرمی جۆراوجۆریان رێکخستوە لە ناو دائیرەدا بە هاووڵاتییانی پڕ ئەکەنەوە. هەندێ لەو فۆرمانە پێوەندییان بە کارەکانی ئەم دەزگایەوە نیە و لە گەڵ جاڕی گەردونی مافی مرۆڤ دا ناگونجێن و سوکایەتیە بە کەرامەتی مرۆڤ. وا نمونەیەکی ئەخەمە بەرچاوی بەڕێزتان.

4. بیگومان بەندە ئەمانە نانوسم بۆ ئەوەی لە نرخی دەزگای ئاسایش و ئەو هەمو خزمەتەی کە بە ئاسایشی گەلەکەمان و یەکیتی کردوە کەم بکەمەوە، بەلکو بە ریز و ستایشیکی تایبەتیەوە ئەروانمە ئەو لایەنەی. زۆری ئەوانەیش کە لەوی کاربەدەستن لەو پیشمەرگانەن کە نزیکی من بون و ئیستاش نزیکی منن. بەڵام ئەم دەزگایە کاتیك دروست بو (انفلاتی امنی) هەبو، پیویستی بەوان بو، ئیستا کۆنترولی ئەمنی وڵات کراوە بۆیە ئەبی سروشت و ئەرکەکانی ئەم دەزگایەش بە پیی هەلومەرجی نوی ریك بخریتەوە.

بۆ چارەسەرکردنی ئەم ناتەواوییانە پێشنیار ئەکەم:

1. هەمو ئەو فۆرم و مولحەقی فۆرمانەی ئاسایش رێکیان خستوە لە کاتی موراجەعەت دا بە هاووڵاتی ئاسایی پڕ ئەکەنەوە سەرلەنوێ چاویان پێدا بخشێنرێتەوە و ئەوەی لە گەڵ جاڕی گەردونی مافی مرۆڤ و کەرامەتی مرۆڤ دا ناگونجێن لەغو بکرێن و، رێگە نەدرێ بە کاربەدەستانی ئاسایش کاری لەو بابەتە دوبارە بکەنەوە و، ئەگەر کردیان هاووڵاتییان بۆیان هەبێ لە دادگا شکاتیان لێ بکەن.

2. چاو بە کاربەدەستانی دەزگای ئاسایش دا بخشێنرێتەوە و، کەسانێك کە پیشەکانیان و خوێندنیان پێوەندییان بە کارەکانی ئەم دەزگایەوە نیە بگۆڕدرێن بە کەسانی قانونی و دەرچوانی کلیەکانی پۆلیس، قانون، علمی اجتماع، علمی نفس، علومی سیاسی، ادارە، میژو، زمانی ئینگلیزی... پاش راهینان و مەشق پێ کردن.

3. لە وڵاتانی دیمۆکراتیدا کۆمیتەیەکی پارلەمانی دائەنرێ بۆ چاودێری دەزگا ئەمنییەکان بۆ ئەوەی لە سنوری قانون دەرنەچن. ئێمە لە بەر ئەوەی حاڵی حازر پارلەمانمان نیە چاك وایە کۆمیتەیەکی سەر بە سوڵتەی قەزایی یان دەزگایەکی سەر بە مافی مرۆڤ چاودێری کارەکانی ئاسایش بکا.

4. ئەو کەسانەی لە ئاسایش لا ئەبرین ئەکری بگویزرینەوە بۆ ناو هیزی پیشمەرگە بە تایبەتی پیشمەرگە کۆنەکان کە ئازا و دلسۆز بون بۆ

یەکیتی.

5. بایەخی تایبەتی بدری بە پۆلیس.
ا. هەندی بەشی تازە بکریتەوە وەکو بەشی مخدرات، تزویر، هەروەها هەیئەتیك بۆ تفتیش.
ب. بەشی (الادله الجنائیه) بە هەمو کەلوپەلە پیویستەکانیەوە بکریتەوە.
ج. (مخافری حدودی) دابمەزرینری.
د. چاویك بە هەمو دەزگاکانیدا بخشینریتەوە و ئەمیش بە هەمان شیوەی ئاسایش موتوربە بکری بە خوینی تازە و بە دەرچوانی جامیعەکان.
ە . بە پیی توانا پیویستیەکانیان لە سیارە، دەمانچە، خولی فیرکردنی لیکۆلینەوە، بۆ دابین بکری.

6. کۆلیجی پۆلیس بۆ پیگەیاندنی ئەفسەر دابمەزرینری.

7. وەکو چۆن نەخۆشخانەی تایبەت بۆ پیشمەرگە تەرخان کراوە، ئەگەر لە توانادا بی نەخۆشخانەیەکیش کە تایبەت بی بە هیزەکانی ئاسایشی ناوخۆ بکریتەوە.

8. بایەخی تایبەتی بدری بە دادگا.
ا. محکمەی تمییز بەهیز بکری و ئەندامەکانی بە پیی قانون زیاد بکرین و، کەسانی لیوەشاوە بۆ الاشراف العدلی، الادعا العام، دیوان التدوین القانونی، رعایه القاصرین دابنری.
ب. سەرەتا 14 حاکمی تازە بۆ ئەم شوینانە تعیین بکری: بۆ دەوروبەری سلیمانی، کفری، کەلار، هەلەبجەی شەهید، هەلەبجەی تازە، پینجوین، چوارتا، دوکان، رانیە، قەلادزە، چەمچەماڵ، کۆیە، دەربەندیخان، سەید سادق.
ج. زەمینە خۆش بکریٚ بۆ تعیین کردنی هەندی حاکمی تازە لە سلیمانی بۆ ئەوەی هەندی لەو حاکمانەی سومعەیان لە روی نەزاهەتەوە زڕاوە، تەقاعود بکرین یان بگویزرێنەوە بۆ شوینی تر.

لە گەڵ ڕێزی بێئەندازەی نەوشیروان مستەفا
سلێمانی، 11 ی کانونی یەکەمی 1999

## 7. دوەمین کۆنگرەی گشتی
## یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان
2001/2/5 –1/30

9 ی 8 ی 2000:

زۆری ئەو هەوڵانەی من ئەیاندەم بە ئەنجام ناگەن. لە ناو م س و لە ناو حکومەتدا لە سەر کاغەز بڕیاری لێ ئەدرێ بەڵام لە سەر ئەرز جێبەجێ ناکرێ یان جێبەجێ ئەکرێ بەڵام وا ئەشێوێنرێ ئەگەر دەستی لێ نەدرایە باشتر بو. سەرانی دەستەبەندیەکانی ناو یەکێتی هەرچی بە قازانجی خۆیان نەبێ تەگەرەی لێ ئەدەن و پەکی ئەخەن، بەڵام زەمینەی ناو یەکێتی تا ئەندازەیەك لە بارە بۆ هەندێ ئاڵوگۆڕ هیچ نەبێ بۆ هەڵبژاردنەوەی سەرکردایەتی و م س و کەمێ چاکسازی لە ناو حکومەتدا. ئەم نامەیەم لە گەڵ ئەم پرۆژەیەدا دەربارەی گرتنی دوەمین کۆنگرەی گشتی یەکێتی بۆ مام جەلال نارد:

نامە

برای گەورە و بەڕێزم مام جەلال

سڵاوێکی گەرم و

هیوادارم هەمیشە شاد و سەرکەوتو بن

بە بۆنەی کۆبونەوەی ئەمجارەی سەرکردایەتی‌یەوە بە چاکم زانی بیروڕای خۆمت دەربارەی گرتنی کۆنگرەی دوەمی یەکێتی بۆ بنوسم:

1. ماوەیەکی درێژ بە سەر بەستنی کۆنگرەی یەکەم دا تێپەڕیوە، کە ئەگەر هەلومەرجی کوردستان ئاسایی بوایە ئەبو لە دوای کۆنگرەی یەکەمەوە تا ئێستا چەندین کۆنگرەی تری تێدا ببەسترایە.

2. پێم وایە هەلومەرجی ناوخۆی یەکێتی و هەلومەرجی سیاسی ئێستای دەوروبەرمان لە بارە بۆ بەستنی کۆنگرە، بە تایبەتی کە ئێستا کێشە و گیروگرگرفت لە ناو یەکێتی‌دا کەمە و، ئاشتی و ئاسایش لە ناوچەکەدا تا ئەندازەیەکی باش بەرقەرارە.

3. وا پرۆژەیەك دەربارەی خۆئامادەکردن بۆ کۆنگرەی دوەم ئەنێرمە خزمەتتان، لەم پرۆژەیەدا ئەوەم لە بەر چاو گرتوە کە پێش کۆنگرەکە زۆری بابەت و کارەکانی گەڵاڵە و ئامادە بکرێ و، کێشە و گیروگرفتەکان بەلادا بخرێن، بۆ ئەوەی کەمترین کێشە و گیروگرفت ببرێتە ناو کۆنگرە.

هیوادارم کەڵکێکی هەبێ.

لە گەڵ ڕێزی بێئەندازەی　　　　　نەوشیروان

سلێمانی، 9 ی ئابی 2000

*

**ئامادەکاری بۆ:**
**دووەمین کۆنگرەی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان**

1. دیاریکردنی کات و شوێنی کۆنگرە:
1. 1. شوێن: قەڵاچوالان، هۆڵی شەهید شەهاب.
1. 2. کات: دوا حەفتەی ساڵ.

2. دیاریکردنی بەرنامەی کارەکانی کۆنگرە:
2. 1. راپۆرتی سکرتێری گشتی.
2. 2. لێدوانی پێڕەوی ناوخۆ.
2. 3. لێدوانی پرۆگرام.
2. 4. لێدوانی بەڵگەکانی تری کۆنگرە.
2. 5. هەڵبژارنەوەی سەرکردایەتی.

3. پێکهێنانی لیژنەی ئامادەکردنی کۆنگرە بۆ ئەنجامدانی:
3. 1. ئامادەکردنی شوێنی گرتنی کۆنگرە و شوێنی مانەوەی ئەندام و میوانەکانی.
3. 2. ئامادەکردنی تەعدیلی پێڕەوی ناوخۆ و پرۆگرام و هەمو بەڵگەکانی تری کۆنگرە.
3. 3. سەرپەرشتی هەڵبژاردنی گشتی نوێنەرانی رێکخستنەکانی یەکێتی بۆ کۆنگرە بە پێی ڕێنماییەکانی مەکتەبی سیاسی.

4. هەڵبژاردن
4. 1. کردنی هەڵبژاردنێکی تازە بۆ ئەندامێتی کۆنگرە.
هەڵبژاردنی پێشو بۆ ڕیکخستنی مەڵبەندەکان بوە نەك بۆ ئەندامێتی کۆنگرە، لە بەر ئەوە پێویستە هەڵبژاردنێکی تازە بکرێ بۆ ئەندامێتی کۆنگرە.
4. 2. دیاریکردنی ئەوانەی مافی بەشداری و دەنگدانیان هەیە لە ناو: مەڵبەندەکانی ڕێکخستن، مەکتەبەکان، دائیرەکانی حکومەت، هێزی پێشمەرگە، ڕێکخراوەکانی دەرەوەی وڵات دا.
لەمەدا پێویستە ئەم تێبینییانە ڕەچاو بکرێ:
4. 2. 1. هەڵبژاردن بۆ هەموان بکرێتە پێوانەی بەشدار بون و دەنگدان.
4. 2. 2. جگە لە ئەندامانی سەرکردایەتی و ئیحتیاتەکانی، رێگە نەدرێ بە هیچ کەسێك بە بێ تێپەڕبون بە هەڵبژاردن دا بەشداری بکات، یان ئەگەر لە بەر هەر هۆیەکی مەعقول، بانگ کرا بۆ بەشداربون، نابێ مافی دەنگدانی هەبێ.
4. 2. 3. هەندێ لە دەزگاکانی یەکێتی، بە تایبەتی مەکتەبەکان و دائیرەکان، پڕکراون لە کەسانی تەعینکراو، نەك لە بەر تێکۆشەری و

زانایی، بەڵکو تەنیا بۆ ئەوەی ژیانیان بۆ دابین بکرێ، بەشدارکردنی ئەمانە بە بێ تێپەڕین بە هەڵبژاردن دا، جۆرێك ئەبێ لە بێعەدالەتی.

4. 3. دیاریکردنی نیسبەتی نوێنەرایەتی ئەندامانی یەکێتی لە کۆنگرەدا. پێویستە ژمارەی ئەندامانی کۆنگرە لە 1.500 کەس تێ نەپەڕێ و، نیسبەتی نوێنەرایەتی بەوجۆرە دیاری بکرێ کە تەنیا ئەم ژمارەیە بگاتە کۆنگرە.

4. 5. بۆ ئەوەی ماوەی دەستێوەردان نەدرێ و هیچ ئەندامێ نەتوانێ دوجار دەنگ بدا، پێویستە:

4. 5. 1. هەڵبژاردنی هەمو مەڵبەندەکان و دەزگاکانی تری یەکێتی لە یەك رۆژدا لە سەعات 8 ی بەیانیەوە تا 5 ی ئێوارە لە بارەگای مەڵبەند یان هەر شوێنێکی تر کە دیاری ئەکرێ، ئەنجام بدرێ.

4. 5. 2. ئەوانەی ئەیانەوێ خۆیان بپاڵێون بۆ ئەندامەتی کۆنگرە بۆیان هەبێ حەفتەیەك پێش رۆژی هەڵبژاردن کورتەیەك لە ژیانی خۆیان و پلەی خوێندەواری و تێکۆشانیان بنوسن و، لە سەر لوحەی اعلاناتی مەڵبەند هەڵی بواسن بۆ ئەوەی لە رۆژی هەڵبژاردن دا دەنگدەران بیاننناسن.

4. 5. 3. لە لایەن هەیئەتێکی بێلایەنەوە کە یەکێکیان حاکم بێ سەرپەرشتی ڕەوتی هەڵبژاردن و جیاکردنەوەی دەنگەکان بکرێ.

*

مام جەلال لە پەراوێزی چەپی سەروی نامەکەدا بە خەتی خۆی نوسیویێتی:

**هەڤالانی کارگێڕی بەڕێز**

**سڵاوێکی گەرم**

**هەمو ناوەرۆکەکەیم پێ باشە. گەر ئێوەش زیاد و کەمتان هەیە بفەرمون.**

دو جاریش ئیمزای کردوە، جارێك لە سەری نوسینەکەیدا و جارێك لە خوارەوەیدا.

*

14 ی 11 ی 2000:

مام جەلال کۆمیتەیەکی پێك هێناوە، بۆ ئامادە کردنی کۆنگرە، هەمویان لەوانەن کە ئەیانەوێ خۆیان دەربچنەوە و دەسەڵاتداری ناو یەکێتی بن. لە کاروباری ناو یەکێتیدا نەك بێلایەن نین بەڵکو خۆیان لایەنن. بە چاکم زانی نامەیەك بنێرم بۆ مام جەلال سەرنجی بۆ ئەو کێشەیە رابکێشم. ئەمەش دەقەکەیەتی:

برای گەورەو بەڕێزم مام جەلال

سڵاوێکی گەرم

هیوادارم هەمیشە لە خۆشیدا بن

ئەو ڕۆژە کە باسی پێکهێنانی کۆمیتەی ئامادەکردنی کۆنگرە کرا بڕیار درا: لە هەر مەڵبەندێ یەکێ و لە هەر مەکتەبێ یەکێکی تێدا بێ.

لە بەر ئەوەی هەندێ برادەر قسەکانی من بە جۆرێکی کە لێك ئەدەنەوە ئەو کاتە بە چاکم نەزانی هیچ تەعلیقێك بدەم. ئەمڕۆ بە هۆی کاك عومەری سەید عەلی‌یەوە زانیم کە جۆری پێکهاتنی کۆمیتەکە چۆنە. ڕاستیەکەی من هەندێ تێبینیم لە سەری هەیە، هەندێ لە برایانی کارگێڕی مەکتەبی سیاسی‌یش وەکو قسەم لە گەڵ کردن لەم رووەوە لە گەڵ من هاوبیرن، تێبینیەکانم ئەمانەیە بە چاکی ئەزانم عەرزی جەنابتانی بکەم:

1. ئەوانەی بونەتە ئەندامی کۆمیتەکە هەمویان لێپرسراوەکانی مەڵبەند و مەکتەبەکانن، واتە ئەندامی م س یان کۆمیتەی سەرکردایەتین و، حاڵی حازر مەسئولی پلەی یەکەمن لە دەزگاکانی یەکێتی‌دا. بۆ ئامادەکردنی کۆنگرەیەك کە یەکێ لە ئەرکە گرنگەکانی هەڵبژاردنەوەی ئەندامانی کۆمیتەی سەرکردایەتی‌یە، ئەم هەمو ئەندامانەی کۆمیتەی سەرکردایەتی تێدا بێ، من بە باش و بە ڕاستی نازانم، چونکە ئەگونجێ بوترێ ئەمانە لە ئێستاوە، لە ڕێگەی ئەم کۆمیتەیەوە، زەمینە بۆ هەڵبژاردنەوەی خۆیان خۆش ئەکەن.

2. کارگێڕی مەڵبەندەکان هەمویان بە هەڵبژاردن هاتون و لە ناو ئەواندا و لە ناو ئەندامانی مەکتەبەکانی ڕێکخستن و ڕاگەیاندن و دەزگاکانی تردا کادری بە توانا و لێوەشاوە هەیە کە بۆ ئەم کارە ئەشێن، هەقە کۆمیتەکە لە نوێنەرانی مەڵبەندەکان و مەکتەبەکان پێك بهێنرێ نەك لە مەسئولەکانیان، بەڵام ئەندامێکی کارگێڕی م س مەسئولیان بێ. بەمەیش هەم کۆمیتەیەکی بێلایەن دروست ئەبێ کە بنکە ڕێکخراوەییەکانی یەکێتی ئەوسا ناتوانن گلەیی لێ بکەن، هەم کۆمەڵێ کادری کەم ناسراویش لە ناو بنکەکانی یەکێتی‌دا زۆرتر ئەناسرێن و دێنە پێشەوە.

لە گەڵ ئەوپەڕی ڕێزی نەوشیروان
سلێمانی، 25 ی ئابی 2000

*

ئەم نامەیە سودی نەبو چونکە کۆمیتەکە خۆی داینا بون و، کۆنگرەکەیان بەوجۆرە ساز ئەکرد کە ئەم ئەیویست، نەك بەوجۆرەی من پێشنیارم کرد بو، ئەترسا ئەمجارەش دەسەڵاتەکانی کەم بکەنەوە.

*

مام جەلال خۆی، هەر لە سەرەتای لاوێتیەوە، هەندێ خوی خراپی هەبوە وەکو:

.........................

......................... (ئۆتۆسانسۆری سبەی کوژاندویەتیەوە)

بەڵام لە هەمان کاتدا هەندێ خوی چاکی هەبوە وەکو:

.........................

......................... (ئۆتۆسانسۆری سبەی کوژاندویەتیەوە)

لە هەموی خراپتر ئەوەیە "نیفاقی سیاسی" بووە بە نەریتێکی پێڕەوی کراوی کارکردنی رۆژانە لە ناو ئۆرگانەکانی یەکێتی‌دا هەر لە سەرەوەی هەتا خوارەوەی.

*

## کۆبونەوە لە گەڵ مەکتەبەکان

لەو چەندانەدا، لە سەر داوای خودی مام جەلال، زنجیرەیەك کۆبونەوەم لە گەڵ ئەندامانی مەکتەبەکان دا رێك خست بۆ ئاڵوگۆڕی بیروڕا و یەکخستنی بیروبۆچونەکان لە سەر کێشەکانی ناو یەکێتی، لە سەر کۆنگرە، جۆری بەستنی، پێڕەوی ناوخۆ، پرۆگرامی سیاسی، نوێکردنەوەی یەکێتی و، جۆری پێکهێنانەوەی مەکتەبی سیاسی و دەزگا سەرکردەییەکانی.

بۆ هەمو کۆبونەوەکان د بەرهەممان بانگ ئەکرد. بەرهەم تازە گەڕابوەوە بۆ ئەوەی شارەزای دیوی ناوەوەی کارەکانی یەکێتی بێ. لەو کۆبونەوانەدا لە گەڵ دو لە بەرپرسە باوەڕپێکراوە نزیکەکانی مام جەلال توشی دەمەقاڵێ بوم. من ئەمویست هەمو پرسیارەکانی خەڵك و ئەندامانی بنکە رێکخراوەییەکان بە توێکڵ کراوی لە کۆبونەوەکان دا باس بکەم بۆ ئەوەی رێوشوێنی چارەسەر کردنی دابنێین:

لە گەڵ مەلا بەختیار، بەرپرسی مەکتەبی رێکخراوە دیمۆکراتیەکان، چەندین مەسەلەمان باس کرد کە پێوەندی بە رێکخراوی پیشەییەوە هەبو. لە میانەی قسەکاندا پرسیم: ئەو ساڵانەی پێشمەرگە بوین چەند جار کەوتوینەتە تەنگانەوە ژمارەمان کەم بۆتەوە مەترسی لە ناوچونمان لە سەر بوە، بەڵام هەرگیز نە کەسمان بە زۆر کردوە بە پێشمەرگە و نە کەسمان بە زۆر هێناوەتە ریزی رێکخستنەوە. ئیستا کە نە لە تەنگانەداین و نە مەترسی لەناوچونمام لە سەرە، گەنجێ 6 ساڵ سەرەتایی ئەخوێنێ، 6 ساڵ ناوەندیو دواناوەندی ئەخوێنێ، 4 ساڵ لە زانکۆ ئەخوێنێ، کە خوێندن تەواو ئەکا هەزار داڵغە و خەیاڵ و خولیا و ئارەزو لە سەریدایەتی. ئەیەوێ دابمەزرێ موچەیەك وەربگرێ بەشی ژیانی بکا. ئەیەوێ ژیانی خێزانی دامەزرێنێ، ئەیەوێ خانوی هەبێ تیا بژی، ئەیەوێ هاوسەر بگرێ... ئێمە بەو وەزعەوە کە هەمانە ناتوانین هیچ کام لەو پێویستی‌یانەیان بۆ دابین بکەین. کە ئەوە ناتوانین بکەین بۆچی بە زۆر "ئیستیمارەی ئینتیما" ی پێ پڕ بکەینەوە، بە بێ ئارەزوی خۆی بیکەن بە ئەندامی یەکێتی تەنیا بۆ ئەوەی دابمەزرێ.

مەلا بەختیار هەڵچو، وتی: زانیاریەکەت راست نیە. ئێمە بە زۆر کەس ناکەین بە یەکێتی.

وتم: زانیاریەکەی من راستە و چەندین بەڵگەم بە دەستەوەیە. ئەو هەر نکولی لێ کرد بۆ ئەوەی نەبێ بە شەڕ، بێ ئەوەی بگەینە هیچ کۆبەندیەك، کۆتاییمان بە کۆبونەوەکە هێنا.

*

لە گەڵ ئەرسەلان بایز، بەرپرسی مەکتەبی ڕێکخستن و، بەرپرسی ئامادە کردنی کۆنگرە، چەندین مەسەلەی ڕێکخراوەییمان باس کرد، باسی مەڵبەندەکان و مەکتەبەکان، هەڵسەنگاندنی هەمە لایەنەی سیاسەتی یەکێتی، لە میانەی قسەکاندا پرسیم: ئەندامانی سەرکردایەتی یەکێتی بە تەمان هەتا کەی لەو شوێنانەی خۆیاندا بمێننەوە ڕێگە نەدەن بە ئەندامی نوێ، بە تایبەتی گەنج، بێنە ناو دەزگا سەکردەییەکانەوە.

جەوی کۆبونەوەکە گرژی تێکەوت. بۆ ئەوەی نەبێ بە شەڕ، بێ ئەوەی بگەینە هیچ کۆبەندیەك، کۆتاییمان بە کۆبونەوەکە هێنا.

ئەوانەی م س زۆربەیان بەستنی کۆنگرەیان پێ خۆش نەبو. نەیان ئەویست جارێکی تر بچنەوە بەردەم هەڵبژاردن. ئەیانویست تا هەتایە لە پایەکانی خۆیاندا بمێننەوە.

ئەرسەلان و مەلا بەختیار ئەوەیان کرد بە بیانو هانایان بۆ مام جەلال برد کە:

من هەڤاڵان ئیهانە ئەکەم

بەم جۆرە گفتوگۆیە ریزەکانی یەکێتی تێك ئەچێ، پشێوی تێ ئەکەوێ

من ئەمەوێ یەکێتی تێك بدەم.

مام جەلال، لە سەر شکاتەکەی ئەوان، بێ هیچ لێکۆڵینەوە و لێپرسینەوەیەك، کۆبونەوەکانی ڕاگرت. من ئەمەم بە لایەنگریی ئەوان و بە ئیهانەم دانا بۆ خۆم. جارێکی تریش بەڵێن و کار و کردەوەکانیم هاتەوە بەرچاو. جارێکی تریش بە کردەوە دەسەڵاتەکانی خۆی خراپ بە کار هێنایەوە و، سەلماندیەوە ئەوەی ئەیڵێ جیاوازە لەوەی ئەیکا.

بیرم کردەوە چی بکەم:

ئەمجارەش بڕۆمەوە بۆ دەرەوە؟

بێدەنگی هەڵبژێرم؟

فەرمانە ناڕاستەکەی جێبەجێ بکەم دەس لە درێژە پێدانی کۆبونەوەکان هەلبگرم؟

بە گژیانا بچمەوە؟

وازیان لێ بهێنم، بە تایبەتی هێشتا هیچ زەمینەی ڕێکخستن یا ئاڕاستە کردنی هیچ جۆرە ناڕەزاییەکی کاریگەر دروست نە بوبو؟

بڕیارم دا واز بهێنم و، بیر لە ڕێگەیەکی تری کار بکەمەوە.

من لە دڵی خۆم دا خەریکی تاووتوێ کردنی ئەو باسانە بوم نامەیەکی مام جەلالم بۆ هات.

4 ی 11 ی 2000

ئەمڕۆ مام جەلال نامەیەکی درێژی بۆ ناردم. لە نامەکەدا بە لایەکی دا ستایشی زۆری کردوم و دەوری منی لە یەکێتی دا بەرز کردۆتەوە، بە لایەکی تری دا هێرشێکی دوژمنانەی توندی کردۆتە سەرم.

هەمو ئەو قسە و قسەڵۆکە ناڕاستانەی چەند وەختە ناحەزەکانم لە ناو باڵە ناکۆکەکانی یەکێتی دا و لە ناو خەڵک دا بڵاوی ئەکەنەوە گۆیا من دژی هەولێری و کەرکوکی و بادینی و یەزیدی و پێشمەرگەی کۆن و ژن و عەرەب و چی و چی... م ئەم لەم نامەیەدا هەموی بە کوردیەکی رون و رەوان لە دژی من "تەوسیق" و "تەقنین" کردوە. لە مێژ بو ئەم بیستەوە و، گومانم ئەکرد ئاشی بەرهەمهێنانی سەرچاوەی بڵاوکردنەوەی زۆری ئەو قسە و باسانە هاوڕێکانی خۆم بن، ئەم نامەیە گومانەکەی کردم بە یەقین.

*

ئەم نامەیە ئەشێ بەشێ بێ لەو جەنگە نهێنی و ژێر بەژێرە پروپاگەندەییەی لە دوای راپەرینەوە بە جۆرێکی سیستەماتیک لە ناو یەکێتیو دەرەوەی دا کاری لە سەر ئەکرد بۆ جێگیرکردنی خۆیو هەڵتەکاندنی من. لە پێش کۆنگرەی یەکەمەوە دەستی پێ کرد بو، لە ڕۆژانی کۆبونەوەکانی کۆنگرەی یەکەمدا بە فراوانی کاری بۆ کردو، دوای کۆنگرەش تا ئێستا درێژەی پێ ئەدا. ئەم نامەیەش نمونەیەکێتی. ئەگینا کەسێک پانزە ساڵی خۆشترین قۆناغی تەمەنی بە پێشمەرگایەتی لە شاخەکانی کوردستاندا بەسەر بردبێو، لە جزیرەی سوریاوە بە پێ سنورەکانی سوریا، تورکیا، عیراقو سنورەکانی ئێرانو تورکیاو عیراقی پێوا بێو پەیوەندی هاورێیەتی لەگەڵ سەدان تێکۆشەری سەرانسەری کوردستان دروست کردبێ، ئەچێتە عەقڵی کێوە ئەو کەسە رقی لە هەولێریو کەرکوکیو بادینی بێ.

لە خۆمم پرسی:

-تۆ بڵێی ئەم هەمو ساڵە من شێت بوبم بۆیە داومەتە شاخ؟

- تۆ بڵێی کەسێ دێوانەی خۆشەویستی نەتەوەو نیشتمانەکەی نەبێ کە کەرکوکو هەولێرو بادینان، بەشێکین بتوانێ بەرگەی پانزە ساڵی ژیانی پێشمەرگایەتی سەردەمی دەسەڵاتی بەعس بگرێ؟

- تۆ بڵێی ئەو هەمو جەولەو شەروشۆرو ناخۆشییانەی لە ناوچەکانی هەولێر کردومەو زۆربەی هەرەزۆری پێشمەرگەو کادیرو فەرماندەکانی هەولێرو خۆشناوەتیو باڵەکایەتی کە تا ئێستاش لە نزیکترین هاورێکانمن ڕاست نەبێ؟

لە خۆمم پرسی:

- ئایا ئەتوانم لەگەڵ کەسێک دا کاری جدی بکەم کە هەمو بۆچونەکانی منی لەسەر گۆڕینی شێوازی سیستمی کاری حیزبایەتی کورت کردۆتەوە بۆ ئەم ستە شەخسیانە کە هیچیان راست نین؟

- ئایا ئەتوانم لەگەڵ سەرکردەو کادرانێکی وادا کار بکەم کە لە جیاتی بیرکردنەوە لە چاککردنی رێکخستنی حیزبو داوودەزگاکانی، کەوتونەتە ململانێیەکی قێزەون بۆ پارێزگاری لە دەسەڵات و بەرژەوەندیە تایبەتییەکانی خۆیان؟

- ئایا ئەوانەی لە خۆیەوە نزیکن بەردەوام پروپاگەندەی دوژمنانە

بۆ هەر قسەیەکی من ئەکەن کە بێ مەبەست یان بۆ مەبەستێکی دیاریکراو وتومە؟

- ئەوخۆی یەکێتی بە خراپ پیشان بدەنو بە ئاقارێکی تری دا ببەن.

- من باسی چاککردنی ئەدائی حکومەت ئەکەم ئەوان ئەڵێن رقی لە هەولێرە، لە بادینانە، لە کەرکوکە.

- من باسی چاککردنی ئەدای ئاسایش، رێکخستنو رێکخراوەکان ئەکەم، ئەوان ئەیخەنە قالبی تۆڵەو رقو قینەوە....

- من ئەمەوێ ئەم ئەخموونە ستالینییەی حیزب کۆتایی بێو حیزبێکی داوودەزگای مۆدێرن دروست بکەین، ئەوان پروپاگەندەی چەبڕینو دەرتکردنو تۆڵەکردنەوەم دوا دەخەن.

- من بیر لە تازەکردنەوەی سەرکردایەتی و مەکتەبی سیاسی ئەکەمەوە، ئەوان ئەچن ئەمە وەک تۆڵەکردنەوە پیشانی ئەمو ئەو ئادەن.

- من ئەمەوێ ئەخلاقی بەزۆرکردنی خەڵک بە حیزبیو تەزکیە نەهێڵین، ئەوان پروپاگەندەی خەڵک شکانو قسەی رەقم دوا دەخەن.

لەم نامەیەوە ئیتر بە باشیو بێ هیچ گومانو دوودڵیەک تێگەیشتم کارکردن لەگەڵ ئەمانەدا ئاسنی سارد کوتانە. باسی هەر شتێک بکەیتو دەست بۆ هەر شتێک بەریت چەندان لێپرسراو بە فیتی ئەم دژی ئەوەستنو ناهێڵن هیچ کارێکی تیا بکەیت.

دوای ئەو هەموو پرسیارە ئەشێ جارێکی تر بتوانم لە گەڵ ئەم کابرایە کار بکەم؟

لەم وڵاتانەدا سەرکردە کە دروست ئەبێ، بە هەر بارێكدا بگۆڕێ، گۆڕینی ستەمە، مەگەر فریشتەی گیانکێشان، حەزرەتی ئیزرائیل، دەستاودەستی هێمنانەی دەسەڵات دەستەبەر بکات. جەمال عەبدوناسر لە میسر، ماوتسی تۆنگ لە چین، مەلا مستەفای بارزانی لە کوردستان، تا خۆیان نەمردن، لە دەسەڵات نەکەوتن، تەنانەت لە هەندێ وڵاتی ئەوروپیدا گەلان بە رێگەی دیمۆکراتی نەیانتوانی ئەو گۆڕینە بکەن: فرانکۆ لە ئیسپانیا، سالازار لە پورتوگال، تیتۆ لە یۆگۆسلاڤیا، تا خۆیان نەمردن هیچ حیزب و هێزێ نەیتوانی بیان گۆڕێ.

بۆ ئەوەی ئازاد بم لە قسە و هەڵسوکەوتی خۆم دا بڕیارم دا وازهێنانی خۆم لە یەکێتی بە مام جەلال و م س بە نوسین رابگەیەنم:

*

نامە بۆ م س

بەڕێز: مەکتەبی سیاسی

یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان

سڵاوێکی گەرم و،

بە هیوای سەرکەوتنتانم لە خەبات و تێکۆشان دا

بەم نامەیە ئەمەوێ وازهێنانی خۆم لە ئەندامەتی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان و پچڕاندنی هەمو جۆرە ئیلتیزامێکی سیاسی و ڕێکخراوەیی لە گەڵی بە ئێوەی بەڕێز ڕابگەیەنم.
لە گەڵ ڕێزی بێئەندازەی نەوشیروان مستەفا ئەمین
سلێمانی، 6ی تشرینی دوەمی 2000
*

**وەڵامی یەکەمی مام جەلال**

هەڤاڵ و برای خۆشەویستم کاکە نەوەی بەڕێز
سڵاوێکی گەرم
شادی و خۆشیتانم داوایە.

هەر ئێستە نامەکەتانم وەرگرت. زۆرسوپاس. تکاو داوای برایانەم ئەمەیە: پەلە مەکەن لە بڕیاری توندوتیژ و "قاتیع". مادام مەسەلەکە لە نێوان خۆموخۆت دەستی پێ کراوە، با پێکەوە تێری بکەین بە نامە و قسەکردن ئەوسا بڕیاری وا بدەن. من نەختێ نەخۆشم ئەگینا ئەهاتم بۆ لاتان.

هەرچۆنێ بێت (صبری انقلابی) باشە.
هەر بژی بۆ
برای دێرین و دلسۆزتان مام جەلال
2000 \ 11 \ 11
*

من وەڵامی ئەم نامەیەم نەدایەوە و، فەرامۆشم کرد.

نامەیەکی درێژی تری بۆ ناردم کە زۆر زیاتر لە نامە درێژەکەی تر ستایش و پیاهەڵدانی تێدا بو. وەڵامی ئەویشم نەدایەوە. من لە لای خۆمەوە بێدەنگیم لێ کرد.

ئیتر هیچ هیوایەکم بە ئیسلاحاتی مام جەلال نەما. بۆم دەرکەوت هەمو ئەو هەوڵانەی من لە گەڵ ئەوی ئەدەم بێ هودەیە و، هەمو ئەو شتانەی ئەویش دەربارەی بژار و چاکسازی و پاکسازی ئەیڵێ هەموی قسەی روتە:

- بۆ گێڕانەوەی دەسەڵاتی، تەواوی بێ مشتومڕی، خۆیەتی بە سەر یەکێتی و پێشمەرگە و حکومەتدا.

- بۆ ترساندنی گەندەڵەکانە بۆ ئەوەی بێنەوە ژێر باری گوێڕایەڵی ئەو.

- بۆ دامرکاندنەوەی ناڕەزایی خەڵك و ئەندامانی یەکێتی و پێشمەرگەیە.

لە بەر ئەوە بڕیارم دا فەرامۆشی بکەم و چیتر خۆمی پێوە ماندو نەکەم. وەڵامی نامەکەیم نەدایەوە. ئەگەر جاران جاروبار لە هەندێ کۆبونەوەی م س دا ئامادە ئەبوم ئیتر بە یەکجاری وازم لێ هێنا ئامادەی هیچ کۆبونەوەیەکی م س نەبوم. لەوەوپێش زۆر کەم سەردانی مام جەلالم ئەکرد وازم لەو کەمەیش هێنا. بە تەواوی خۆمم لێ

دورخستەوە.
*

لەو ماوەیەدا هەم سەلاح رەشید، کە وەزیری مافی مرۆڤ و، هەم شازاد سائیب کە وەزیری کشتوکاڵ بو، لە گەڵ من لە هەمان ماڵ ئەژیان.

شازاد بە نابەدڵی لە ژێر گوشاری مام جەلالدا وەزارەتەکەی قبوڵ کرد بو. پێش ئەوە نوێنەری یەکێتی بو لە تورکیا. زۆر کەم هاتوچۆی مام جەلالی ئەکرد.

سەلاح لە هەمومان زیاتر هاتوچۆی مام جەلالی ئەکرد. رۆژێکیان سەلاح پێی راگەیاندم مام جەلال پێی وتوە کە ئەگەر شەو لە ماڵ بم، مام جەلال ئەیەوێ بۆ قسە کردن بێتە سەردانم. پێم وت باشە لە ماڵ چاوەڕێی ئەکەم، بەڵام پێم خۆشە وەکو شایەت بۆ مێژو: تۆش و کاک شازادیش لە دانیشتنەکەدا بۆ گوێگرتن دابنیشن.

ئێوارە مام جەلال هات. سەلاح خۆی دزیەوە زوتر لە ماڵ دەرچو بو بۆ ئەوەی ئامادەی کۆبونەوەکە نەبێ. شازاد مابوەوە، دوای ئەوەی ئیزنمان لە مام جەلال وەرگرت، ئەویش لە کۆبونەوەکەدا لە گەڵمان دانیشت.

وتی: من دەس پێ بکەم یا تۆ؟

وتم: داواکە هی خۆتە فەرمو جەنابت دەس پێ بکە!

وتی: من بە نامە، بە خەتی خۆم و بە قەڵەمەکەی خۆم، رەئی خۆمم لە سەر تۆ نوسیوە، ئەمەوێ بزانم رەئی تۆ لە سەر من چیە و چی بکەین.

وتم: لێرە بم یا لە هەر جێگایەکی دنیا بم دژی تۆ نابم. ئیستا جەنابت کەسی یەکەمی وڵاتی، سەرۆکی هەرێمیت، سکرتێری گشتی یەکێتیت، فەرماندەی گشتی هێزی پێشمەرگەیت، ئەتوانی فەرمانی کوشتنم دەر بکەی، فەرمانی گرتنم دەر بکەی، فەرمان بکەی وڵات بە جێ بێڵم. گەردنت ئازاد بێ هەر فەرمانێکیان دەر ئەکەی من بێ بەرگری جێبەجێی ئەکەم، بەڵام بەوپەڕی سەراحەتەوە ئەڵێم: باوەڕم نە بە خۆت و نە بە قسەکانت و نە بە حیزبەکەت و نە بە سەرکردایەتیەکەی نەماوە. نە دژتان ئەبم و نە ئیشتان لە گەڵ ئەکەم.

بەمە کۆتاییمان بە قسەکانمان و بە دانیشتنەکەمان هێنا.

لە رۆژانی 30 ی 1 تا 5 ی 2 ی 2001 دوەمین کۆنگرەی گشتی یەکێتی بەسترا:

من لە دانیشتنی یەکەمی رۆژی یەکەمی کۆنگرەکەدا، بۆ پیشاندانی یەکریزی یەکێتی، لە ریزی "دەستەی دامەزرێنەر" ی یەکێتی دا، لە سەر خواستی زۆر لە دۆست و هاوڕێکانم، بەشدار بوم. ئەگەرچی لە نزیکەوە چاودێری کۆنگرەم ئەکرد، بەڵام لە هیچ لیژنە و چالاکیەکی کۆنگرەکەدا بەشدار نەبوم. دوای کۆنگرەش هیچ پۆستێکی حیزبی یا حکومەتیم وەرنەگرت.

دەستەبەندیەکانی ناو یەکێتی، بە رێگای پیلانی ژێربەژێر، هەر

یەکەیان خەریکی دەرچواندنی نوێنەرەکانی خۆیان بون.

پێوەرێك نەبو بۆ ئەندامەتی کۆنگرە. مام جەلال، کۆسرەت، جەبار، ئەرسەلان، "باج" یان بۆ حیمایەکانی خۆیان دابین کرد بەشداری دەنگدان بن. سەدان کەسیان هێنا بە ناوی نوێنەرانی رێکخستنە نهێنیەکانی هەولێر، کەرکوك، بادینانەوە بۆ دەنگدان.

مام جەلال، پێڕەوە کۆنەکەی بە ئارەزوی خۆی دارشتەوە، هەمو دەسەڵاتەکانی لە دەستی خۆیدا کۆ کردەوە.

سەرکردایەتیەك هەڵبژێردرا مام جەلال بە تەواوی فەرامۆشی کردن و، بێ پرس و ئاگاداری ئەوان ئەندامانی م س دانا.

*

کاتێ رۆژانە روداوەکان و باری سەرنجی خۆمم بە زەقی و رەقی تۆمار ئەکرد، هەمیشە ئەم بەیتە شیعرەی "نالی" م لە دڵی خۆمدا ئەوتەوە:

دڵم بەردە، ئەگەر شاخە، بە چاوی سوکیی مەنواڕێ
بە خۆڕایی نەسوتاوە، ئەمیشە کێوی تورێکە!

2009/25/11

http://sbeiy.com/ku/article_detail.aspx?ArticleID=2426&AuthorID=36&AspxAutoDetectCookieSupport=1